
تصوير ابو عبدالرحمن الكردي
مختصر
صحيح البخاري
المسمى بـ:
التجريد الصريح
دانراوى: أبى العباس زين الدين الزبيدى
بە كوردى كردن و لێكۆڵینەوەی
نورى فارس حمه خان
بەگوێرەی تەخريجی ( د. مصطفى ديب البغا ) تەخريج كراوە
محمود أحمد محمد
پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی كردووە
(پاشكۆی بەرگی دووەم)
دار المعرفة
بيروت - لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

*******************************************

📖 ناوى كتيب : مختصر صحيح البخارى المسمى بـ( التجريد الصريح ).

📖 دانراوى : ابي العباس زين الدين الزبيدي.

📖 وەرگیرانى : نورى فارس حەمەخان.

📖 تيراژ ( ٢٥٠٠ ) دووهەزارو پينج سەد دانـە.

📖 ژمارەى سپاردن : ( ٢٤٦٤ سالى ٢٠٠٩ ).

📖 سالى چاپ : ٢٠١٠ ز ١٤٣١ ك

📖 كۆمپيوتەرو هەلە چنين : ( روبار حسين/كۆمپيوتەرى شانيا )




المُسَمَّى

# بِالتَّجْرِيدِ الصَّرِيحْ


دانراوی: أبی العباس زين الدين الزبيدی

به كوردی كردن و ليكۆڵينەوەی

**نوری فارس حمه خان**

بەگوێرەی تەخريجی ( د. مصطفی ديب البغا ) تەخريج كراوە

**محمود أحمد محمد**

پێيدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی كردووە



2010 ز     1431 ك

﴿ پاشكۆی بەرگی دووەم ﴾

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## باسی بڕیاری هەندێ شت بۆ کەسێ لەئیحرام دا بێ

٨٣٦- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) قَدْ أُحْصِرَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَلَقَ رَأْسَهُ وَجَامَعَ نِسَاءَهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ، حَتَّى اعْتَمَرَ عَامًا قَابِلاً. (الحديث: ١٨٠٩)[٢٤٣].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرو هاوڕێیانی لەمەدینەوە بەرەو مەککە لەمانگی ناو جەژنانا بەڕێکەوت بۆ عەمرە کرن بێ بڕواکانی قوڕەیش لەحودەیبییە ڕێگەی بەیتیان لێ گرتن‌و لەوێ گیریان خوارد، جا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەرو یارانی لەوێ مەنع کران لە تەواوکردنی عەمرە، لەلایەنی دوژمنەوە، ئیتر وشترە دیارییەکانیان سەربڕی‌و پێغەمبەر سەری خۆی تاشی‌و دروست بوو لەگەڵ ژنەکانی، وەلە ساڵی ئاییندەدا عەمرەی کردەوە. (تاج/٢/٢٥١ ز/١٣٢).

٨٣٥- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) يَقُولُ: أَلَيْسَ حَسْبُكُمْ سُنَّةَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِنْ حُبِسَ أَحَدُكُمْ عَنِ الْحَجِّ طَافَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّى يَحُجَّ عَامًا قَابِلاً، فَيُهْدِي أَوْ يَصُومُ، إِنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا. (الحديث: ١٨١٠)[٢٤٤].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئایا سوننەتی پێغەمبەرتان بەس نییە؟ ئەگەر کەسێ لەئێوە تەواوکردنی حەجی لێ قەدەغەکراو لەلایەن دوژمنەوە یا بەهۆی ناساخییەوە، ئەوا تەوافی بەیت بکاو صەفاو مەروە بکا، ئینجا ئیحرامی تەواو بشکێنێ لەهەموو شتێ، وەلە ساڵی ئاییندەدا حەجەکەی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر هەیبوو دەشێ قوربانییەك

---

[٢٤٣] لاحظ ماجاء في خاتمة كتاب الإحصاء وجزاء الصيد، (فتح/٤/٨٠-خاتمة-المترجم).

[٢٤٤] حسب الخاتمة هذا الحديث وافقة مسلم على تخريجه، وقال العيني في رواية مسلم... الخ، (عيني/١٠/١٥٤). -المترجم-

سەر ببڕێ، ئەگینا ئەگەر نەیبوو دەبێ دە ڕۆژ بەڕۆژوو بێ. (تاج/٢/٢٤٩ ز/١٢٢).

٨٣٦- عَنِ الْمِسْوَرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَحَرَ قَبْلَ أَنْ يَحْلِقَ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ بِذَلِكَ. (الحديث: ١٨١١)[٢٤٥].

میسوەرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ ڕێکەوتنەکەی حودەیبیە لەپێش دا وشترە دیارییەکانی خۆی سەربڕی، ئەوجا سەری خۆی تاشی، وەلە هەمان کاتا دەستووری بەهاوڕێکانیشی دا کەئەوانیش هەروا بکەن، لەپێشا دیاریی بەیت سەربڕن، ئەوسا سەریان بتاشن. (تاج/٢/٢٥١ ز/١٢٣).

٨٣٧- أَنَّ كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ حَدَّثَهُ قَالَ وَقَفَ عَلَيَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحُدَيْبِيَةِ ، وَرَأْسِي يَتَهَافَتُ قَمْلاً فَقَالَ « يُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ » . قُلْتُ نَعَمْ . قَالَ « فَاحْلِقْ رَأْسَكَ - أَوْ قَالَ - احْلِقْ » . قَالَ فِيَّ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ( فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ ) إِلَى آخِرِهَا . فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ، أَوْ تَصَدَّقْ بِفَرَقٍ بَيْنَ سِتَّةٍ ، أَوِ انْسُكْ بِمَا تَيَسَّرَ » . (الحديث ١٨١٥، أطرافه ١٨١٤ ، ١٨١٦ ، ١٨١٧ ، ١٨١٨ ، ٤١٥٩ ، ٤١٩٠ ، ٤١٩١ ، ٤٥١٧ ، ٥٦٦٥ ، ٥٧٠٣ ، ٦٧٠٨) وعنهُ رضي في رواية: قالَ: نزَلَتْ في خاصة وهي لكم عامة (الحديث ١٨١٦)[٢٤٦].

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی حودەیبیەدا، ئاگرم لەژێر مەنجەڵێکا خۆش دەکرد، ئەسپێ لەسەرم هەڵ دەوەری لەبەر زۆری، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆلام، فەرمووی پێم: ئەم جرو جانەوەرانەی سەرت ئازارت دەدەن؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: دەسەرت بتاشە، لەپاشا مەڕێ یا بزنێکی خێر سەربڕە،

[٢٤٥] حسب الخاتمة وافقه مسلم عليه — المترجم.

[٢٤٦] اخرجه مسلم في الحج، باب جواز حلق الراس.... رقم: ١٢٠١.

یاخود سێ رۆژ بەڕۆژوو بە، یاخود سێ مەن خورما بدە بەشەش هەژار. (تاج/٢/٢٥٣ ز/١٢٥).

لەگێڕانەوەیەکا: کەعب فەرمووی: ئەم ئایەتە {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ} بەهۆی منەوە هاتە خوارەوە، من هۆی هاتنی بووم، کە بەهۆی ئەو ئەسپێ تێدانەوە نەخۆش بوومو ئیتر ئایەتەکە دابەزی بۆ چارەسەری ئەو حاڵەی من، بەڵام بڕیارو حوکمەکەی گشتییە، بەتێکڕایی بۆ هەمووتانە.

**راڤەو شیکردنەوە:**

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خوای لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەر بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هۆی هاتنی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوو کەئێستا خوێندرایەوە، ئامادەی رۆژی حودەیبییە بوو، لەشەڕێکا دەستێکی پەڕی، لەکووفە دادەنیشت، خەڵکی مەدینەو کووفە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەهێزتر راو بۆچوون ئەوەیە کەساڵی پەنجاو سێ لە مەدینە مردووە لەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا.

٨٣٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ قَالَ انْطَلَقْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ، وَلَمْ أُحْرِمْ، فَأُنْبِئْنَا بِعَدُوٍّ بِغَيْقَةَ فَتَوَجَّهْنَا نَحْوَهُمْ، فَبَصُرَ أَصْحَابِي بِحِمَارِ وَحْشٍ، فَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَضْحَكُ إِلَى بَعْضٍ، فَنَظَرْتُ فَرَأَيْتُهُ فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ الْفَرَسَ، فَطَعَنْتُهُ، فَأَثْبَتُّهُ، فَاسْتَعَنْتُهُمْ، فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي، فَأَكَلْنَا مِنْهُ، ثُمَّ لَحِقْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَخَشِينَا أَنْ نُقْتَطَعَ، أَرْفَعُ فَرَسِي شَأْوًا، وَأَسِيرُ عَلَيْهِ شَأْوًا، فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ بَنِي غِفَارٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ فَقُلْتُ أَيْنَ تَرَكْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ تَرَكْتُهُ بِتَعْهِنَ وَهُوَ قَائِلٌ السُّقْيَا. فَلَحِقْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَتَيْتُهُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَصْحَابَكَ أَرْسَلُوا يَقْرَءُونَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ وَبَرَكَاتِهِ، وَإِنَّهُمْ قَدْ خَشُوا أَنْ يَقْتَطِعَهُمُ

الْعُدُوُّ دُونَكَ، فَانْظُرْهُمْ. فَفَعَلَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا اصَّدْنَا حِمَارَ وَحْشٍ، وَإِنَّ عِنْدَنَا فَاضِلَةً. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَصْحَابِهِ « كُلُوا ». وَهُمْ مُحْرِمُونَ. (الحديث: ١٨٢٢، وأطرافه ١٨٢١، ١٨٢٣، ١٨٢٤، ٢٥٧٠، ٢٨٥٤، ٢٩١٤، ٤١٤٩، ٥٤٠٦، ٥٤٠٧، ٥٤٩٠، ٥٤٩١، ٥٤٩٢)[٢٤٧].

وَعَنْهُ فِي الرِوايَةِ: قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْقَاحَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى ثَلاَثٍ، وَمِنَّا الْمُحْرِمُ، وَمِنَّا غَيْرُ الْمُحْرِمِ. (الحديث ١٨٢٣).

وَعَنْهُ فِي الرِوايَةِ: فَقَالَ: فَلَمَّا أَتَوا رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– قَالَ: «أَمِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَنْ يَحْمِلَ عَلَيْهَا أَوْ أَشَارَ إِلَيْهَا». قالُوا: لا، قَالَ: فَكُلُوا مَابَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا). (الحديث ١٨٢٤).

ئـەبو قـەتادە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: لەخزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لەمەدینـەو دەوروبەرییـەوە بـەرەو مەککـە دەرچووین بۆ عەمرە، ساڵی ڕێکـەوتی حودەیبییـە، لەعوسـفان هـەواڵ گەیـشت بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێ) کـە لەشـکرێکی دوژمـن والـە غـەیق، کەشـیوێکە وا لـەنێوانی مەککـەو مەدینـەدا، جـا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) دەستەیەکی نارد بۆ سۆراخی ئەو دوژمنە من لەو دەستەیە بووم، بەرەو ئەوان ڕۆیشتین، هاوڕێکانم ئیحرامی عەمرەیان دابەست، من ئیحـرامم دانەبەست، جاکاتێ گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبـەر، هاوڕێکـانم کـەرە کێوییـەکیان بینـیو لـەناو خۆیانـا دەسـتیانکرد بەپێکـەنین، کـەوا هـەڵێکی وایـان بـۆ هەڵکەوتووە، بـەڵام لەبـەر ئیحـرام بەسـتنەکەیان دەسـتەڵاتی هیـچیان نییـە، منیش تەماشایم کردو بینیمو ئەسپەکەمم لی تاوداو، ڕمێکم لێ داو چەسپم کـرد لەجێگـەی خۆیـدا، جـا داوای یارمـەتیم لـەهاوڕێکانم کـرد کـە لەگـەڵما هـەڵبگرن، بـەڵام قایـیل نـەبوون، کـەهیچ کۆمەکییـەکم بکـەن لـەم لایەنـەوە،

---

[٢٤٧] اخرجه مسلم في الحج، باب: تحريم الصيد للمحرم، رقم/١١٩٦.

لەپاشان لەگۆشتەکەیمان خوارد، لەرێ کە گەڕاینەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مەترسی ئەوەمان هەبوو، کە دوژمن برمان بکەن و بنەبڕمان بکەن.

جا سەرێ بەغارو سەرێ بەڕەوت دەڕۆیشتین، تا لەنیوە شەوا گەیشتین بەپیاوێ لەخێڵی نەوەی غیفار، من لێمپرسی لەکوێ پێغەمبەرت بەجێ هێشت؟ گوتی: لەتەعهین بەجێم هێشت، کە ئاوێکە سێ میل لەگوندی سوقیاوە دوورە، پێغەمبەر کە من بەجێم هێشت دەیویست وچانی نیوەڕۆ لەگوندی سوقیا بگرێ، کە گوندێکە وا لەنێوانی مەککەو مەدینەدا، لەوێ سەرخەوێ بشکێنێ.

ئەبوقەتادە فەرمووی: جا من خۆم گەیاندە لای پێغەمبەرو عەرزیم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! هاوڕێکانت کەلەگەڵ من دا بوون، عەرزی سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەتی خودایان هەیە لەخزمەت دا، وە مەترسی ئەوەیان هەیە کە دوژمن بڕیان بکاو دوور لەتۆو لەسوپاکەت قەڵاچۆیان بکا، کەواتە چاوەڕوانیان بکە هەتا دێن ئەویش لەوێ چاوەنواڕی کرد هەتا هاتن جا من عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە کەرە کێوییەکمان راو کردووە، وەهەندێ لەگۆشتەکەیمان لەلاماوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) بەهاوڕێکانی خۆی کە لەئیحرامیشدا بوون فەرموو: (لێی بخۆن، زیانی نییە بۆ ئیحرامەکەتان).

لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەبوقەتادە فەرمووی: لەقاحە، کەشیوێکە دەوری میلێ لەسوقیاوە دوورە، لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، هەمان بوو لەئیحرامدا بوو، وەهەمان بوو بێ ئیحرام بوو، ئەوجا تەواوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەبوقەتادەدا فەرمووی: هاوڕێکانی کاتێ هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری لێ کردن: ئایا

كەستان پێی گوت کە بنیشێتە سەری، یا کەس لەئێوە ئەو نێچیرەی پێ نیشان دا؟ گوتیان نەء، فەرمووی: دە ئەوەی ماوە لەگۆشتەکەی لێی بخۆن لەکاتی وادا، لەبارودۆخی ئاوادا، خواردنی گۆشتی نێچیر زیانی نییە بۆ خاوەنی ئیحرام.

## راڤەو شیکردنەوە:

مەبەستی سەرەکی لەم فەرموودەیە رونکردنەوەی بڕیاری راوکردنو لەگۆشتی نێچیری راوکراو خواردنە بۆ کەسێ لەئیحرامی حەج یا عەمرەدا بێ.

٨٣٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ (رضي الله عنه) أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِمَارًا وَحْشِيًّا، وَهُوَ بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ « إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنَّا حُرُمٌ ». (الحديث-١٨٢٥). (طرفاه ٢٥٧٣، ٢٥٩٦) [٢٤٨].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەئیحرام دا بوو، صەعبی کوڕی جەسام (ڕەزای خوای لێ بێ) کەرە کێوییەکی بەدیاری بۆ هێنا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دایەوە بەسەریاو وەری نەگرت لێی، ئەوکاتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئەبواء بوو، کەناوی کێوێکە یان لەوەددان بوو، کەناوی شوێنێکە وا لەنزیکی جەعفەدا ئەبواء لەوەددان لەجەحفەوە نزیکترە، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کەسەیری کرد رووی صەعب بەهۆی ئەم وەرنەگرتنەوە گرژبوو، وەپێی ناخۆش بوو، دڵی دایەوەو پۆزشی بۆ هێنایەوەو فەرمووی: لەبەر ئەوەی واین لەئیحرام دا بۆیە لێت وەرناگرین، دەنا لێمان وەردەگرتی.

---

[٢٤٨] اخرجه مسلم في الحج، تحريم الصيد المحرم: رقم: ١١٩٣.

٨٤٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ « خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ كُلُّهُـنَّ فَاسِـقٌ، يَقْـتَلْنَ فِـي الحِـلِّ والْحَـرَمِ الْغُـرَابُ وَالْحِـدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ ». (الحديث-١٨٢٩)، طرفه في: ٣٣١٤[٢٤٩].

عائيشه (ڕەزای خوای لـێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بـێ) پێنـج جانەوەری هەن لەڕادە دەرچوون‌و زیانیان لەئەنـدازە بەدەرە، لەبەرئـەوە چ لـەخاکی حـەرەم‌و چ لەشـوێنێکی تـر جگـە لـەخاکی بەسـت، کوشـتنیان دروستەو دەکوژرێن، ئەوانیش ئەمانەن: قەلەڕەش‌و کۆلارەو دوپشك‌و مـشك‌و سەگی نهێنی گر. (ت/٢/١٦٤ ف/٤ – ش/د/ت/ن).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

زۆرینەی مامۆستایانی یاساناسی ئایینی دەفـەرموون: مەبەسـت لـە کـەلبی عەقوور لەم فەرمودەیەدا هەموو دڕندەیەکە کە زۆرینەی کات زیانـە خرۆبـێ. شێخ عـەینی لـە ڕاڤـەکردنی ئـەم فەرموودەیـەدا دەفـەرموێ: (وذهـب الـشافعي والثوري وأحمد وجمهور العلماء الى أن المراد كل مفترس غالباً.

٨٤١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ بَيْنَمَـا نَحْـنُ مَـعَ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي غَارٍ بِمِنًى، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِ ( وَالْمُرْسَـلاَتِ ) وَإِنَّـهُ لَيَتْلُوهَـا، وَإِنِّي لأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ، وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا، إِذْ وَثَبَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « اقْتُلُوهَا ». فَابْتَدَرْنَاهَا، فَذَهَبَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « وُقِيَتْ شَـرَّكُمْ كَمَـا وُقِيـتُمْ شَـرَّهَا ». (الحـديث ١٨٣٠، أطرافـه ٣٣١٧، ٤٣٣، ٤٩٣١، ٤٩٣٤)[٢٥٠].

عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعود (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ لەشـەوی عەرەفـەدا لـەمینا کـە خـاکی بەسـت (حـەرەم)ە، لەئەشـکەوتێکا

[٢٤٩] اخرجه مسلم في الحج، باب: تحريم الصيد المحرم، رقم: ١١٩٣.

[٢٥٠] اخرجه مسلم في الحيوا. (عيني/١٠/١٨٤ – مترجم.

لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، سەرگەرمی حەجی ماڵاوایی بووین، لەوکاتەدا سوورەتی (والمرسلات)ی بۆهات، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی ئەم سوورەتەی بەقەدرو ڕێزەوە دەخوێندەوە، منیش وشە بەوشەو ئایەت بەئایەت لەدەمی پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) وەرم دەگرتو لەبەرم دەکرد، ئالەم کاتەدا کە هێشتا سوورەتەکە بەسەر زاری پێغەمبەرەوە بوو، وە دەمی پیرۆزی پێی تەڕو پاراو بوو، لەپڕ لەناکاو مارێ دەرپەڕیو پەلاماری داین!.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی بیکوژن، بەڵام مارەکە دەرباز بوو، ڕۆیشت بۆمان نەکوژرا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەم ئەو قوتاری بوو لەچنگی ئێوەو هەم ئێوە قوتار بوون لەوەزنی ئەو!. (تاج/٢٢٤/٧ ز/٦٠ – ش).

٨٤٢– عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – زَوْجِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِلْوَزَغِ « فُوَيْسِقٌ ». وَلَمْ أَسْمَعْهُ أَمَرَ بِقَتْلِهِ. (الحديث ١٨٣١، طرفه ٣٣٠٦)[٢٥١].

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لەهاوسەرانی بێ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەبارەی شەوگەردەوە فەرمووی: (شەوگەرد جانەوەرە زیانە خۆرۆیانەیە کە وەزەنو زیانیان لەڕادە بەدەرە، عائیشە فەرمووی: بەڵام لەپێغەمبەرم نەبیستووە کە دەستووری کوشتنی شەوگەرد دەربکات). (بڕوانە: تاج/١٨/٤ ز/٤).

### ڕاڤەو شیکردنەوە:

مەبەست لەوەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەشەوگەرد دەفەرموێ: لەڕادە دەرچووە ئەوەیە کە کوشتنی لەخاکی بەست (حەرەم)و

[٢٥١] اخرجه مسلم في باب: استجاب قتله الوزغ رقم/٢٢٣٩.

لەخاكی نابەست (حل)دا دروستە، هەتا بۆ ئیحرام داریش چونكە پێشەوا بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی لە صەحیحی بوخاریدا، بەم ناونیشانەیە گێڕاوەتەوە: (باب ما يقتل المحرم من الدواب / باسی ئەو جانەوەرانەی كە دروستە بۆ ئیحرام دار بیان كوژێ). (بڕوانە: ریاض/١٣٥٩/٤).

٨٤٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ افْتَتَحَ مَكَّةَ « لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا. (الحديث، ١٨٣٤)[٢٥٢].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی ئازادكردنی شاری مەككە، كەناوداره بەفەتحی مەككە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپاش ئازادكردنی شاری مەككەو ئیسلام بوونی خەڵكەكەی، ئیتر كۆچ كردن لەمەككەوە بۆ مەدینە نەما، چونكە مەككەیش وەك مەدینە بوو بەخاكو وڵاتی ئیسلامو وەلەژێر ركێفی كافرانا دەرچوو، بەڵام كۆششو تێكۆشانو جیهادو غەزاكردنو نیازی پاك هەرماونو هەردەمێننو هەتا هەتایە دەبن بەهۆی سەربەرزی هەردوو جیهانو مایەی ڕوو سووریی لەلای خودای گەورە، جا هەر كاتێ داواتان لێ كرا كەدەربچن بۆ غەزا، دەرچنو بڕۆن بۆی. (تاج/٧٥ ز/١٩ — ش/د/ت/ن).

٨٤٤- عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ احْتَجَمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُحْرِمٌ بِلَحْيِ جَمَلٍ فِي وَسَطِ رَأْسِهِ. (الحديث ١٨٣٦، طرفه ٥٦٩٨)[٢٥٣].

ئیبنو بوحەینە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەئیحرام دا بوو، لەلەحیی جەمەل بوو، كە جێگەیەكە وا

[٢٥٢] اخرجه مسلم في الحج، باب: تحريم مكة وصيدها وفي الإمارة باب المبايعة بعد فتح مكة على الإسلام رقم: ١٣٥٣.

[٢٥٣] أخرجه مسلم في الحج، باب: جواز والحجامة للمحرم، رقم: ١٢٠٣.

لەنێوان مەدینەو مەککەدا، بەڵام لەمەدینەوە نزیکترە، کەڵەشاخی لە ناوەڕاستی سەری خۆی گرت، لەبەر ئازارێ کە لەسەریدا بوو کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: شەقیقە.

٨٤٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ. (الحديث ١٨٣٧، أطرافه ٤٢٥٨، ٤٢٥٩، ٥١١٤)[٢٥٤].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ مەیمونەی هاوسەری مارەکرد لەئیحرام دا بوو. (تاج/٢/١٦٥ ز/٨٥ ش/د/ت/ن).

٨٤٦- عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْعَبَّاسِ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ. وَقَالَ الْمِسْوَرُ لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ. فَأَرْسَلَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْعَبَّاسِ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ، وَهُوَ يُسْتَرُ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ مَنْ هَذَا فَقُلْتُ أَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْعَبَّاسِ، أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَغْسِلُ رَأْسَهُ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ، فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ اصْبُبْ. فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ وَقَالَ هَكَذَا رَأَيْتُهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَفْعَلُ. (الحديث ١٨٤٠)[٢٥٥].

عەبدوڵڵای کوڕی حونەین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسو میسوەری کوڕی مەخرەمە (ڕەزای خوایان لێ بێ) لە ئەبواء بوو لە ڕاجیاییان ئیبنو عەباس دەیفەرموو: ئیحرامدار مافی

---

[٢٥٤] اخرجه مسلم في الحج، باب: جواز والحجامة للمحرم، رقم:١٢٠٣.

[٢٥٥] اخرجه مسلم، راجع (صم/٩/١٩٦ – مبحث تحريم نكاح المحرم وكراهة..) –المترجم–

ئەوەی هەیە کە سەری خۆی بشۆرێ، میسوەر دەیفەرموو: ئیحرامدار مافی ئەوەی نییە کە سەری خۆی بشۆرێ. جا ئیبنو عەبباس منی نارد بۆ خزمەتی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، کە گەیشتمە خزمەتی، تەماشامکرد لەبەینی دوو شاخی چەرخی بیرەکەدا خۆی دەشۆرێ، بە جلکێ پەردەی بۆ کرابوو منیش لەم دیو پەردەکەوە سلاوم لێکرد، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم، عەبدوڵلای کوڕی حونەینم، ئیبنو عەباس ناردوومی بۆ خزمەت جەنابت، کە لێت بپرسم: کاتێ پێغەمبەر لەئیحرامدا بوایە چۆن چۆنی سەری خۆی دەشۆرد؟ ئەبوئەیوب ئەوکاتە خۆی لەئیحرامدا بوو، جا دەستی خۆی لەسەر پەردەکە دانا، کەمێ داینەواند، هەتا سەری لەمنەوە دەرکەوت، ئەوجا بە مرۆڤێکی فەرموو: کە ئاوی دەکرد بەسەریا ئاوی پیاکە، ئەویش ئاوەکەی کرد بەسەریدا، ئەوجا ئەبوئەیوب بەهەردوو دەستی خۆی قژی خۆی هەڵگلۆفتو لەپێشە سەریەوە دەستەکانی برد بۆ پشتە سەریو لەوێوە هێنانیەوە بۆ پێشەوە، وە فەرمووی: بەچاوی خۆم دیم کە پێغەمبەری خودا خۆی دەشۆردو لەئیحرامدا بوو، وە هەروەها پێغەمبەرم دی لەو خۆشۆردنەدا سەری خۆی ئاوا هەڵدەگلۆفت، کەمن ئێستا لەبەر چاوی تۆ کردم. (تاج/٢/١٦٦ ز/٨٦ — ش/د).

٨٤٧– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ –صلى الله عليه وسلم– دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ. فَقَالَ « اقْتُلُوهُ ». فَقَالَ مَالِكٌ نَعَمْ. (الحديث ١٨٤٦، أطرافه في ٣٠٤٤، ٤٢٨٦، ٥٨٠٨)[٢٥٦].

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هاتە ناو شاری مەککەوە، کڵاو زرێیەکی لەسەردا بوو، کە کڵاوزرێیەکەی داکەند،

---

[٢٥٦] اخرجه مسلم في الحج، باب: جواز دخول مكة بغير إحرام، ١٣٥٧.

لەوکاتەدا پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەر خودا! ئیبنو خەطەل ئەو دوژمنە پیسە دامێنی کەعبەی گرتووەو پەنای بردۆتە بەر بەیت لەترسانا، جاتۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: بیکوژن ئامانی مەدەن، جا نەطنیو سەعیدی کوڕی حورەیث کوشتیان، چونکە کاتی خۆی لەئیسلام وەرگەڕا بوو، وە موسولمانێکی بەناهەق کوشتبوو، وەهەجوی پێغەمبەریشی دەکرد. (تاج/٢/٢٦٥ ز/١٣١ — ش/د/ت/ن) + (تاج/٨/١١ ز-٤٠ ف/٢).

٨٤٨– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ أَفَأَحُجُّ عَنْهَا قَالَ « نَعَمْ. حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ قَاضِيَةً اقْضُوا اللَّهَ، فَاللَّهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ ». (الحديث ١٨٥٢، طرفاه ٦٦٩٩، ٧٣١٥)[٢٥٧].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: ژنێ لەهۆزی جوهەنیە هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیکرد ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم لەژیاندا ئاه (نەزر)ی کرد بوو کە حەج بکا، بەلام هەتا مرد حەجی نەکردو ئاهەکەیی جێ بەجێ نەکرد، ئایا دروستە من لەباتی ئەو حەجی بۆبکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، دروستە نابینیت ئەگەر گریمان دایکت قەرزێکی مرۆڤێکی لەسەر بێ، تۆ ئەو قەرزەی بۆ دەبژێریتەوەو قەرزەکە جێگەی خۆی دەگرێ، کەواتە قەرزی خودای گەورەیش بدەنەوە، بگرە لەم بابەتەدا خودای گەورە شایانترە کە قەرزو مافی خۆی پێ بدرێتەوە. (تاج/٢/٢٤١ ز/١١٧ — د/ت/ن-س/ص، تاج/٢/١٥٦ ز/٨٠ ف/١+٢+٣، ریاض الصالحين ب/٣ ل/٩٣٤ ز/٢٣٣ ف/٩،١٠ + ب/١/١٦٨ ز/٢١ ژ/١٧٩).

---

[٢٥٧] قال العسقلاني رحمه الله تعالى: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عباس، (احتجم وهو محرم) وحديث التي نذرت ان تحج عن امها. (خاتمة/٤/٨٠). —المترجم.

٨٤٩- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ حُجَّ بِى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ. (الحديث ١٨٥٨)[٢٥٨].

سائیبی کوڕی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منالٚ بووم، حەوت سالانە بووم، لەحەجی مالٚئاوایی دا، لەگەلٚ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) باوکم حەجی پێ کردم. (ریاض/٣/٩٣ ز/٢٣٣ ف/١١) + (تاج/٢/١٥٧ ز/٨٠ ف/٥).

٨٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ لَمَّا رَجَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ حَجَّتِهِ قَالَ لأُمِّ سِنَانٍ الأَنْصَارِيَّةِ « مَا مَنَعَكِ مِنَ الْحَجِّ ». قَالَتْ أَبُو فُلاَنٍ - تَعْنِي زَوْجَهَا - كَانَ لَهُ نَاضِحَانِ، حَجَّ عَلَى أَحَدِهِمَا، وَالآخَرُ يَسْقِي أَرْضًا لَنَا. قَالَ « فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً مَعِي ». (الحديث ١٨٦٣، طرفه ١٧٨٢)[٢٥٩].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: سالٚی حەجی مالٚئاوایی کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەحەجەکەی گەڕایەوە، بە ئومو سینانی ئەنصاریەی فەرموو: ئەوە بۆ ئەم سالٚ نەهاتیت بۆ حەج؟ گوتی: ئەبو سینانی مێردم، دوو ولاخی ئاوکێشی هەیە، خۆی و کوڕەکەی بەسواری یەکێکیان چوون بۆ حەج، ئەویتریشیان غولامەکەمان ئاوی پێ دەکێشاو ئاوی پێ هەلٚدەگۆزی بۆ ئاودانی دێبەرەکان، لەبەر ئەوەی پێم نەکرا بێم بۆ حەج، فەرمووی: دەبزانن عەمرەیێ لەڕەمەزانا خۆی دەدا لەحەجێ کە لەگەلٚ مندا بکرێ. (تاج/٢/٢٤١ ز/١١٧ ف/٥ + ریاض/٣/٩٢٤ ف/٨).

٨٥١- عن أبي سَعِيدٍ - (رَضِي اللهُ عَنْهُ) وَقَدْ غَزَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثِنْتَيْ عَشْرَةَ - غَزْوَةً - قَالَ أَرْبَعٌ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوْ قَالَ يُحَدِّثُهُنَّ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) - فَأَعْجَبْنَنِي وَآنَقْنَنِي « أَنْ

[٢٥٨] قال العسقلاني: لم يوافقه مسلم على تخريجه، خاتمة/٤/٨٠. المترجم.

[٢٥٩] هذا الحديث اخرجه مسلم في الحج وفي الصوم. (عيني/١٠/١١٦). -المترجم.

لاَ تُسَافِرَ امْرَأَةٌ مَسِيرَةَ يَوْمَيْنِ لَيْسَ مَعَهَا زَوْجُهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ، وَلاَ صَوْمَ يَوْمَيْنِ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ مَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِي، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى ». (الحديث ١٨٦٤)[٢٦٠].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) کە دوازدە غەزای لەخزمەت پێغەمبەردا لەگەڵ دوژمنی ئیسلاما کردبوو، فەرمووی: چوار شتم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی ژنەوتووە، هەرچواریان چوون بەدڵماو زۆر دلگیرن:

یەکەم: ژن بەبێ مێردی یا بەبێ کەسێکی خۆی لەگەڵیدا نەچێ بۆ سەفەرێ، کە ئەو جێگەی بۆی دەچێ لەدوو رۆژە ڕێگە دوور تربێ، کە ماوەی کورتکردنەوەی نوێژە.

دووەم: نەگرتنی رۆژووی ئەم دوو رۆژە: رۆژی جەژنی ڕەمەزان‌و رۆژووی جەژنی قوربان.

سێیەم: وازهێنان لەنوێژکردن لەپاش کردنی نوێژی بەیانی هەتا خۆر دەردەکەوێ.

چوارەم: بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ سەفەر ناکرێ، بۆ مەسجیدول حەرام لەمەککە بۆ مزگەوتی پێغەمبەر لەمەدینەو بۆ مەسجیدی ئەقصا لەقودس. (تاج/١/٣٤٩ ف/٢ ز/١١٥) + (فیقهی ئاسان/١/١٩٨ — ١٩٩ ز/٧٠).

### راڤەو شیکردنەوە:

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەمەبەستی راستینەی ئەم جۆرە فەرموودەیە بە ئیقتیباس لەسەر باسی (سفر المرأة مع المحرم) لەکتێبە ناودارەکەی دوکتۆر یوسف قەرضاوی (خودا سەربەرزی هەردوو جیهانی بفەرموێ) ئەم رونکردنەوەیە دەنووسین.

---

[٢٦٠] اخرجه مسلم في الحج، باب: سفر المراة مع محرم الى وغيره، رقم: ١٣٤٠.

## سەفەرکردنی ژن بەتەنها بەبێ کەسێکی خۆیی

أ- لەصەحیحەین دا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نابێ ژن بەبێ خۆیی (مەحرەم) بچێت بۆ سەفەر.

ب- دیارە کەبایست (عیللەت)ی ئەم نەهیکردنە لەو رۆژگارەدا کەپڕ لەدزو جەردەو پیاو خراپ بووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم مەبەستە بەرزە، (لەدیدو بۆچوونی ئیسلام دا، ناموس‌و گیان‌و سامانی ژنان، زۆر عەزیزو بەڕێزن، دەبێ بەهەر نرخێ بێ بپارێزرێن، رێز بۆ ژن وەك نوور وایە بۆ چاو).

دەی لە چەرخێکا کە پیاوێ ئازا بەبێ چەك‌و بەبێ هاوڕێیەکی دلێری وەك خۆی نەتوانێ ماڵەوە ماڵ بکا، چۆن ئەقڵ دەیگرێ کە ژنێ بەتاقی تەنیا یا لەگەڵ پیاوی نەناسدا بەپێ یا بەسواری وشترێ یا شتێ تر ملی رێ بگرێ‌و بکەوێتە ئەو دەشت‌و دەرو چۆڵ‌و بیابانە پڕ مەترسیانە، خۆ ئەگەر زیان لەناموس‌و سامانیشی نەکەوتایە، مسۆگەر سەری بەسەلامەتی دەرنەچوو، خۆ ئەگەر لەسەر زەنشتی خودایش قوتاری ببوایە، لەتانەو بوختانی خەڵك رزگاری نەدەبوو، خۆ ئەگەر لەدزو جەردەیش دەرباز ببوایە، لەدڕندەی کێوی دەرباز نەدەبوو، لەمارو مێرو گەزندە ئەمین نەدەیوو، بەڵام لەم سەردەمەدا بارودۆخ گۆڕاوە، سەفەر بەفڕۆکەو خۆشڕۆو شەمەندەفەر دەکرێ، ژن لەماڵ دەردەچێ هەتا دەگاتە جێگەی مەبەست لەگەڵ کۆمەڵێ مرۆڤی رۆشنبیردا دەڕوا، کە لەسەرو ماڵ‌و ناموسی خۆی ئەمین دەبێ، کە زیانی بۆی نابێ جا ئەگەر ئافرەتێکی مەرد، لەباودۆخێکی ئاوادا، سەفەری دوورو درێژ بکا، لەکوێ بەر نەیکردنی ئەم فەرموودەیە دەکەوێ؟ کەواتە ڕاستە کەزاناکانی ئوصوول دەفەرموون: بڕیارو حوکم بەبوون‌و نەبوون لەگەڵ بایست‌و هۆکەیدا دەسووڕێ، (الحكم يدور مع العلة سلباً وإيجاباً).

ئەمە لەدێرینیش دا زاناکان رێگەی کاری وایان داوە، وەك ئەوە ژن بەبێ لەگەڵ بوونی مێرد بچێ بۆ حەج، بەمەرجێ لەگەڵ چەند ژنێکی تری بڕوا

پێکراودا بچێ، یاخود لەگەڵ کاروانێکی ئەمینا بڕوا، هەروەك لە فەرموودەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کەلەسەردەمی حوکمی ئیسلامدا دنیا وا ئەمینو هێمن دەبێتەوە، ژنی کەژاوەنشین لەحیرەوەبەبێ هاوڕێتیی مێردی دەچێ بۆ مەککە، واتە: بەبێ ئەوە کەسێکی خۆیی لەگەڵا بێ.

حەزرەتی عائیشەو چەند کەسێکی تر لە دایکانی موسوڵمانان لە سەردەمی عومەردا، لەگەڵ ژنی متمانە پێکراودا، یا لەگەڵ کاروانی ئەمین دا دەچون بۆ حەج، وەك ئەوە لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەفانو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف دا دەچوون بۆ سەفەری حەج. (بڕوانە: تاج/٣٦٣/٤ کوردی ج/٣ ص/٢٨٧ عمدة القارئ/١٦ ص/١٣٤ ص/٢٧٣ + فتح الباري الحديث/١٤١٣ وأطرافه: ١٤١٧، ٣٥٩٥، ٦٠٢٣، ٦٥٣٩، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣، ٧٤٤٣، ٧٥١٢).

٨٥٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى شَيْخًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ قَالَ « مَا بَالُ هَذَا ». قَالُوا نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ. قَالَ « إِنَّ اللَّهَ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ ». وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ. (الحديث ١٨٦٥، طرفه ٦٧٠١)[٢٦١].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پیرەمێردێکی بینی، خۆی دابوو بەسەر شانی دوو کوڕی خۆیدا بەلارە لارە خۆی بەکێش دەکرد، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەمە بۆ وا دەکا؟ کوڕەکانی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، نەزری لەسەرە بڕوا بۆ خانەی خودا، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەی ئیختیار: سواربەو بەسواریی بڕۆ بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەت، خودا هەوەجای بەتۆو بەنەزری تۆ نییە، وە هەوە جێی بەوە نییە کەئەم پیرەمێردە ئاوا ئازاری خۆی بدا. (تاج/٣/٢٣٩ ف/١+٢+٣).

---

[٢٦١] اخرجه مسلم في النذر، باب من نذر ان يمشي الى الكعبة، رقم: ١٦٤٢.

٨٥٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ، وَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَفْتَيْتُهُ، فَقَالَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ « لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ ». (الحديث ١٨٦٦)[٢٦٢].

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خوشکێکم نەزری کردبوو کە بەپێی پەتی بڕوا بۆ خانەی خودا، وە گوتی بەمن کە بۆ ئەمە پرسی بۆ بکەم لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جا کاتێ پرسیارم لێ کرد لەم بارەیەوە فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): بابە پیادەیش‌و بەسواریش بڕوا بەجێبەجێ کردنی نەزرەکەی. (تاج/٢/٢٣٩ ز/١٣٢ ف/٣).

## پایانێ

مامۆستای گەورەو سەروەر شێخی عەسقەلانی لەکۆتایی کیتابی جەزائی صەیدا، دەفەرموێ:

باسەکانی موحصەرو جەزائی صەیدو بابەتەکانی تری دوایان هەتا ئێرە بریتین لە (٦١) فەرموودە، (١٣) فەرموودەیان بێڕشتەن، واتە موعەللەقن، ئەوانی تریان (٦١-١٣=٤٩) کە چل‌و نۆ فەرموودەن هەموو پەیوەستن، واتە مەوصولن، (٣٨) فەرموودەیان دووبارەن، هەیانە هەر لەم شوێنەدا دووبارەیە، هەیانە لەپێشتر دووبارەیە، پوختەکەیان (٦١-٣٨=٢٣) بیست‌و سێ فەرموودەن، پێشەوا موسلیمیش هەموویانی گێڕاوەتەوە جگە لەمانەیان:

١- فەرموودەی ژمارە ١٨٣٨ لەبارەی چار پۆش گرتنەوەو ژنی ئیحرامدارو دەستکێش لەدەستکردنی، لەتەجریدەکەدا نییە.

٢- ئیبنو عەباس (أحتجم وهو محرم). (٨٤٤ ت=١٨٣٦ ف).

٣- ئیبنو عەباس (إن أمي نذرت أن تحج). (الترمذي ٨٤٨ = ١٨٥٢ ف).

٤- سائیبی کوڕی یەزید (حج بي مع رسول الله)، (٨٤٩ ت=١٨٥٨ ف).

---

[٢٦٢] اخرجه مسلم في النذر، باب: من نذر ان يمشي الى الكعبة، رقم: ١٦٤٤.

٥- فـەرموودەی ژمـارە (٨٥٠ ت = ١٨٦٣ ف) دوو گێڕانەوەیـە، گێڕانـەوەی ئیبن‌و عـەباس لەموسلیم دا هەیـە، وەك لەپێشەوە ئاماژەی بـۆ کـراوە، بـەڵام گێڕانەوەی جابیر لەموسلیما نییـە، بڕوانـە فـەتح الباری کۆتـایی فـەرموودەی ژمارە ١٨٦٣.

عەسقەلانی دەفەرموێ: سەرەڕای ئـەم شەسـت‌و یـەك فەرموودەیـە دوازدە بیسراو (أثر)ی صەحابەو تابیعینیشی وا تیادا لە تەجریدەکەدا، لەم پوختەیـە هـەر بیـست‌و سـێکەیان هـەن، کەئەمانـەن، بـەڵام هەیانـە لـە تەجریدەکـەدا ژمارەی بۆ دانراوە:

١- (٨٣٤ ت = ١٨٠٩ ف): قد أحصر رسول الله فحلق رأسه.

٢- (٨٣٥ ت = ١٨١٠ ف): اليس حسبكم سنة رسول الله.

٣- (٨٣٦ ت = ١٨١١ ف): نحر قبل يحلق.

٤- (٨٣٧ ت = ١٨١٥ ف): يؤذيك هوامك.

٥- (٨٣٧م ت = ١٨١٦ ف): نزلت في خاصة وهي لكم عامة.

٦- (٨٣٨ ت = ١٨٢١ ف): فبصر أصحابي بحمار وحش....

٧- (٨٣٨م/١ ت = ١٨٢٣ ف): كنا مع النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلم) بالقاحة من.

٨- (٨٣٨م/٢ ت = ١٨٢٤ ف): أمنكم أحد أمره أن يحمل عليها...

٩- (٨٣٩ ت = ١٨٢٥ ف): انه أهدى لرسول الله حماراً وحشياً.

١٠- (٨٤٠ ت = ١٨٢٥ ف): خمس من الدواب... فواسق.

١١- (٨٤١ ت = ١٨٣٠ ف): إذ نزل عليه والمرسلات وإنه.

١٢- (٨٤٢ ت = ١٨٣١ ف): قال للوزغ فويسق.

١٣- (٨٤٣ ت = ١٨٣٤ ف): لا هجرة ولكن جهاد ونية.

١٤- (٨٤٤ ت = ١٨٣٦ ف): أحتجم... وهو محرم.

١٥- (٨٤٥ ت = ١٨٣٧ ف): تزوج ميمونة وهو محرم.

١٦- (٨٤٦ ت = ١٨٤٠ ف): فوجدته يغسل بين القرنين.

١٧- (٨٤٧ ت = ١٨٤٦ ف): دخل عام الفتح وعلى رأسه المغفر.

١٨- (٨٤٨ ت = ١٨٥٢ ف): إن أمي نذرت أنتحج فلم تحج.

١٩- (٨٤٩ ت = ١٨٥٢ ف): حج بي مع رسول الله.

٢٠- (٨٥٠ ت = ١٨٦٣ ف): لأم سنان مامنعك من الحج؟

٢١- (٨٥١ ت = ١٨٦٤ ف): غزا مع النبي (صَلى اللهُ عَليهِ وَسلم) ثنتي عشرة غزوة.

٢٢- (٨٥٢ ت = ١٨٦٥ ف): إن الله عن تعذيب هذا نفسه لغني.

٢٣- (٨٥٣ ت = ١٨٦٦ ف): نذرت أختي أن تمشي الى بيت الله.

## ٣٥- باسەكانی فەزڵو گەورەیی مەدینە (أبواب فضل المدينة)

٨٥٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ، مِنْ كَذَا إِلَى كَذَا، لاَ يُقْطَعُ شَجَرُهَا، وَلاَ يُحْدَثُ فِيهَا حَدَثٌ، مَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ». (الحديث ١٨٦٧، طرفه ٧٣٠٦)[٢٦٣].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەدینە لەنێوانی كێوی عەیرەوە هەتا كێوی ثەور، ئەم ماوەیە هەمووی ڕێزدارە، بەستو حەرەمو قەدەغەیە، نابێ ڕێزی بشكێ، دارو درەختی نباڕێ، ناڕەوایی تیادا بەرپا ناكرێ دەی هەر كەسێ ناڕەوایی تیادا بەرپا دەكات نەفرەتو لەعنەتی خوداو فریشتەكانیو مرۆڤەكانی سەرجەم لەسەر بێ.

### ڕاڤەو شیكردنەوە:

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێت:

---

(٢٦٣) اخرجه مسلم في الحج، باب: فضل المدينة ودعاء النبي، رقم: ١٣٦٦.

١- لەعنەت (نەفرەت) لەم شوێنەدا، بەواتا بێ بەشبوونی ئێجگاری نییە لەڕەحمەتی خودا، وەك نەفرەت لەبێباوەڕ واتای وایە، بەڵام نیشانەی ئەوەیە كە بەرپاكردنی ناڕەوایی لەتاوانە گەورەكانە.

٢- نەفرەتكردن لەدەستەی تاوانكاریو خراپەكاران دروستە، بە شێوەیەكی گشتی نەك بەشێوەی تایبەتی.

٣- كورتو پوخت پێغەمبەر دوانزە میلی بەدەوری شاری مەدینەدا داناوە بەحەرەم.

٨٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « حُرِّمَ مَا بَيْنَ لاَبَتَي الْمَدِينَةِ عَلَى لِسَانِي ». قَالَ وَأَتَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَنِي حَارِثَةَ فَقَالَ « أَرَاكُمْ يَا بَنِي حَارِثَةَ قَدْ خَرَجْتُمْ مِنَ الْحَرَمِ ». ثُمَّ الْتَفَتَ، فَقَالَ « بَلْ أَنْتُمْ فِيهِ ». (الحديث ١٨٦٩، طرفه ١٨٧٣)[٢٦٤].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: لەسەر زمانی خۆی لەم پەڕی مەدینەوە تا ئەو پەڕی مەدینە بەستو قەدەغەیە (واتە: لەخڕە بەرداوییەكەی ئەو پەڕی هەتا خڕە بەرداوییەكەی ئەوپەڕی) ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) ڕۆیشت بۆناو خێڵی بەنی حاریثە! كە لەلابەرزەكەی خڕە بەرداوییەكەوە بوون، فەرمووی: خێڵی بەنی حاریثە! وابزانم ئێوە ماڵەكانتان لەدەرەوەی سنووری بەستی مەدینەدایە. لەپاشا كە ئاوڕی دایەوەو بەباشی سەرەنجی دا، فەرمووی: نەء، لەدەرەوەی سنووری بەست نین، هێشتا وان لەناو سنووری حەرەمی مەدینە.

٨٥٦- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ مَا عِنْدَنَا شَيْءٌ إِلاَّ كِتَابُ اللَّهِ، وَهَذِهِ الصَّحِيفَةُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ، مَا بَيْنَ عَائِرٍ إِلَى كَذَا،

---

[٢٦٤] قال العسقلاني في خاتمة (كتاب فضائل المدينة) وافقه مسلم على تخريجها سوى حديث ابي هريرة في ذكرى بني حارثة.... الخ. —المترجم.

مَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ ». وَقَالَ « ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ، وَمَنْ تَوَلَّى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ ». (الحديث ١٨٧٠)[٢٦٥].

ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەرکەسێ گومان بکا، کە ئێمە کە کەس‌و کاری پێغەمبەرین، نامەو نوسراوێکی تایبەتمان لەلا هەیە، کە لەلای خەڵکی تر نەبێ، هەر کەسێ گومانی وا بکا درۆ دەکا، ئێمەش کە ئاڵ‌و بەیتی پێغەمبەرین وەك سەرجەمی موسوڵمانانی تر بەگشتی بەس قورئانی پیرۆزمان لەلا هەیە، بەڵام حوکم‌و بڕیارەکە ی بۆ هەموانە، نەك هەر بۆ خۆمان، وەك ئەم چەند فەرموودەیە کەلەم تۆمارەدا نوسیومنەتەوە، کە فەرموودەی پێغەمبەرن (درودی خوای لەسەر بێ): (مەدینە لەنێوانی عەیرەوە هەتا چیای ثور بەستە، واتە: حەرەمە، جا هەر کەسێ کارێکی ناڕەوای تیا بەرپا بکا یا پیاو خراپێکی تیادا پەنا بدا یا کارێکی ناشایستەی تازە قەڵای تیا بکاو بەباو لەعنەت‌و نەفرەتی خوداو نەفرەت‌و لەعنەتی هەموو فریشتەکان‌و لەعنەت‌و نەفرەتی هەموو مرۆڤەکانی لێبێ لە ڕۆژی قیامەت دا خودا نە فەرزو نە سوننەتی لێ قەبوڵ ناکا، موسوڵمان بۆ پەیامی ئەمان دان بەکافران‌و بەبێ بڕوایان هەموویان چوون یەکن، هەرە خوارینەکەیان مافی ئەمان پێدانی هەیە، بەهەر کافرێ بیەوێ ئەمانی پێبدا جا هەرکەسێ موسوڵمانێ ئامانێ بدا بە کەسێك‌و ئەو تێکی بدا، لەعنەت‌و نەفرینی خوداو فریشتەکان‌و ئەو خەڵکەی هەموو لەسەر بێ لەرۆژی قیامەتا، نەسوننەت‌و نە فەرزی لێ گیرا نابێ، وە نەفرین‌و لەعنەتی خوداو فریشتەو

---

[٢٦٥] اخرجه مسلم حسب خاتمة كتاب فضائل المدينة في الفتح/٣/١٠١ إنظر (صم ٩/١٤٣ – ١٤٥) فضل المدينة ودعاء النبي.... المترجم.

ئادەمیزاد هەموو لەسەر ئەو کەسە بێ، کە حاشا لەباوکی خۆی دەکاو خۆی دەکا بە نەتەوەی پیاوێکی تر، وە هەروا لەسەر ئەوکەسە بێ کەحاشا بکا لەئازاد کەری خۆیو کەسی تر بکا بەئاغای ئازادکەری خۆی، کەشتی وا سەر دەکێشێ بۆ پووچکردنەوەی مافی وەلاو سەرداری کەشەرع داینـاوە لەنێوانی ئازاکەرو ئازاکراودا، ئەم جۆرە کەسانە لەقیامەت دا نەتەوبەیان لێ قەبووڵ دەکرێ نە تۆڵەو بریتیو کەفارەتیان لێ وەردەگیرێ).

**راڤەو شیکردنەوە:**

وەك مامۆستا عەینیو عەسقەلانی دەفەرموون: ئەم فەرموودەیە بەپەرچو رەددە لەسەر داوا پووچەکەی شیعەکان کە دەڵێن: گوایە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) بەنهێنی زانیارییەکی زۆری بەعەلیو کەسو کاری عەلی گوتووە، لەبابەت دەستوورەکانی شەرعو کاروباری راسپێریو لەسەر وەسێتی پێغەمبەرو شتی تری وا.

(ذمة) واتە: عەهد، عەهدیش واتە پەیمان، بۆیە بەعەهد دەگوترا نیمە چونکە ئەو کەسەی کەپەیمان دەدا ئەگەر نەیباتە سەرو بێ پەیمان دەرچێ لەسەر ئەوە ذەم دەکرێ، بەکوردی واتە: سەرزەنشتو سەرکۆنە دەکرێ.

جا لەسەر ئەم بنیاتە لەکاتی بەکوردی کردنی وشەی (ذیمة)دا، ئەگەر بگوترێ: بێ سەرکۆنە ئەوە پەسنە، نەوەك زەمو سەرکۆنە کەواتە دەچینەوە سەر بنەوانی کارەکە کە (عهد)ە وە بەزیمە دەڵێین پەیمان.

## بێداری

حەزدەکەم، بابەتێکی شەرعی رووت دوور لە رەگەز پەرستیو شتی تری لەم بابەتە، ئەم دوو خاڵە زۆر گرنگە روون بکەمەوە.

١- لەم رۆژگارەی ئێمەدا، بەداخەوە (متسید) زۆر بووە، واتە سەیدە درۆینە زۆر بووە، لەبنەماڵە ناودارەکانی کوردستان تا ئێستا بەشێخی بەرماڵ ناسراون، شێخی بەرماڵ واتە: بەخوا ناسی شێخی بەرماڵی پێ بەخشراوە، بەنەسەب سەید نییە، کەچی ئێستا بەترە مەهانەیێ بەخەونێ بەفەتوای کۆلکە مەلایێ خۆیان کردووە بەسەیدی بەرزنجە، ئەو کەسانەی کەبەم شێوانە خۆیان دەکەن بە (سید) بەر هەرەشەی ئەم فەرموودەیە دەکەون، چونکە سەیدی ساخ مافی خۆی ڕێزی خۆی هەیە زەکاتو شتی وای پێ ناشێ، هەقی لە (خمس الخمس)دا هەیە.

٢- لەم رۆژگارەی ئێمەدا، کە قەهری قەومیو جەوی سیاسی گەیشتونەتە لووتکە، هەیە بەزۆری زۆرداری تەغییر قەومییەت بەرەعییەتی خۆیان دەکەن، بەوێنە کوردن دەیانکەن بە عەرەب، عەرەبن دەیانکەن بەتورکو فورس، یا بەپێچەوانەوە.

٣- هەیە لەبەر بەرژەوەندی ماددی خۆی، خۆی دەکا بەعەرەب، یا بە توورك یا بەئینگلیز، واتە: مرۆڤەکە بە ئارەزووی خۆی قەومییەتەکەی دەگۆڕێ.

دیارە کە ئەمە شتێکی نارەوایە، چونکە زۆر لە بڕیارەکانی شەرعی خودا پەیوەندییان بەنەسەبو بنەچەوە هەیە، یا بە لەقەبو کونیەوە هەیە، وەك کەفائەت لە ژنهێنان دا تەدلیس لە زانستی فەرموودەدا، بێگومان کەئەم بابەتە زۆر گرنگە، پێویستی بە توێژینەوەی زۆر هەیە، لێرەدا تەنیا ئەوەندە دەڵێم: (گەلێ جار ڕۆژگار کارێکی وا دەکا مرۆڤێ دەکەوێتە دوورە وڵات، بەرە بەرە زمانی خۆی ڕەگەزی خۆی لەبیر دەچێتەوە، خۆیو ماڵو منالی دەبێ بەیەکێ لەو میللەتەی کە لەناویانا دەژین، ئەمەیان جیایە، هەر لەم روانگەوەیە کە ئێستا لەناو هەموو وڵاتە ئیسلامەکاندا سید هەیە).

٨٥٧- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). « أُمِرْتُ بِقَرْيَةٍ تَأْكُلُ الْقُرَى يَقُولُونَ يَثْرِبُ. وَهْيَ الْمَدِينَةُ، تَنْفِي النَّاسَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ ». (الحديث ١٨٧١)[٢٦٦]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: فەرمانم پێ کراوە کە کۆچ بکەم بۆ گوندێ لە گوندان دەبەزێنێ، ناپاکان پێی دەڵێن یەثریب واتە لۆمەو سەرزەنشت بەلاّم هەر خۆی سەرکولّی شارانەو ناوی خۆی وا بەخۆیەوە کە مەدینەیە، ئەم شارە گەندەکانی مەردوم رەهەنە دەکا، وەك چۆن مووشەدەمەو کوورە چلّك و ژەنگی ئاسن لادەبەن!. (تاج/٢/٢٩٠-٣) + (تاج/٢/٢٧٧ ز/١٨٣ س/ف/١).

٨٥٨- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَقْبَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ تَبُوكَ حَتَّى أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَقَالَ « هَذِهِ طَابَةُ ». (الحديث ١٨٧٢)[٢٦٧].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەغەزای تەبووك دەگەڕاینەوە کەلەمەدینە نزیك بووینەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەمە طابەیە، واتە: شارێکی خۆش و باش و سازگارو خاوەنی دانیشتووی باشە. (تاج/٢/٢٧٦ ز/١٣٨).

٨٥٩- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ « يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لاَ يَغْشَاهَا إِلاَّ الْعَوَافِ - يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ - وَآخِرُ مَنْ يُحْشَرُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ، يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا، فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا ». (الحديث ١٨٧٤)[٢٦٨].

---

[٢٦٦] اخرجه مسلم في الحج، باب: المدينة تنفي شرارها، رقم: ١٣٨٢.

[٢٦٧] مسلم، انظر صم/م ص/١٥٦ -- المترجم.

[٢٦٨] اخرجه مسلم في الحج، باب: في المدينة حين يتركها اهلها رقم: ١٣٨٩.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنە وتم لەپێغەمبەری ئازیزو خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو: مەدینە لەو پەڕی خۆشیو باشی دا دەبێ، کە دانیشتووەکانی بەجێی دەهێڵن، وا چۆڵو هۆڵ دەبێ کەس سەری پیاناکا، مەگەر مەلو مۆرو جانەوەری مووشەکەر کە بۆ ملۆمووشو مووشەکردن دەچن بۆ هەوارە کۆنو شوێنی چۆڵ بووا وە دواترین کەسیش کە لەوڵات دەردەکرێنو دەبرێن دوو شوانی موزەینەیی دەبن، دەیانەوێ کە بچن بۆ مەدینە، دەنگ لە ڕانەکەیان دەکەنو پیر کەدەکەن بەناویا، جا کە دەچن تەماشا دەکەن مەدینە چۆڵو هۆڵو سامناکو چۆلەکە بکوژی تیانیە، جا لە مەدینە دەردەچنو دەڕۆن دەگەنە ثەنییەتول وەداع، لەوێ بەسەردەما دەکەون خرپ دەمرن!. (تاج/٢/٢٩٠ ز/١٤٣ ف/٢ — ش).

٨٦٠– عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– يَقُولُ « يُفْتَحُ الْيَمَنُ فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ثُمَّ يُفْتَحُ الشَّامُ فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ثُمَّ يُفْتَحُ الْعِرَاقُ فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَنْ أَطَاعَهُمْ وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ». (الحديث ٣٤٣١)[٢٦٩].

سوفیانی کوڕی ئەو زهیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەری خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو: یەمەن ئازاد دەکرێو دەبێ بەوڵاتی ئیسلام، جا زۆر کەس بەگورجی دێنەوە بۆ مەدینەو کەسو کاری خۆیانو ئەوانەی بەگوێیان بکەن هەڵیان دەگرنو دەیانبەن بۆ یەمەن، لەبەر زۆری رزقو رۆزیو ژیواری خۆشو باشی یەمەن. بەڵام ئەگەر

---

[٢٦٩] اخرجه مسلم في الحج باب: الترغيب في المدينة عند فتح الأمطار، رقم: ١٣٨٨.

بزانن مەدینەیان گەلێ باشترە وە شامیش هەروەها وە عێراقیش هەروەها، کە ئازاد دەکرێن خەڵك لەمەدینەوە روو دەکەنە ئەوێ، ئەگەر بزانن مەدینەیان باشترە.

**راڤەو شیکردنەوە:**

سوفیانی کوڕی ئەبو زهیر (ڕەزای خوای لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە ئەزییە لەئەزدی شەنوو ئەیە لەبوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، ئیبن‌و زوبەیرو سائیبی کوڕی یەزید فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە، ئەوەیش نیشانەی ئەوەیە کە هاوڕێیەکی شکۆمەند بووە، لەمەدینە نیشتەجێبووە. (تاج/٢٨٩/٢ ز/١٤٣ -١- ش/ن).

٨٦١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِنَّ الإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا ». (الحديث ١٨٧٦)[٢٧٠].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: وەکوو چۆن مار کە زۆری بۆ هات دەخزێتەوە ناو کونی خۆی‌و پەپکەی تیا دەخوات، لەبەر بێ دەرەتانی، ئیسلامەتیش بە تایبەتی لەئاخر زەمانا ئاوەها تەنگی پێ هەڵدەچنرێ‌و ئاوەها دەکشێتەوە بۆ ناو مەدینەو گرمۆڵەی تیا دەخوات. (تاج/٢/٢٧٧/٤ ز/١٣٨ – ش/ت).

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دروستە شتی باش تەشبیە بکرێ بەشتی خراپەوە، مادەم تەشبیهەکە دەبێ بەهۆی رونکردنەوەی مەبەست، وە واتای وایە کە مەرج نییە موشەببەهو بیهی، لە هەموو روویەکەوە وەکوو یەك بن، بەڵکوو ئەوەندە بەسە کە لەڕوویەکەوە لەیەك بچن.

---

[٢٧٠] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان ان الإسلام بدا غريباً، رق: ١٤٧.

٨٦٢– عن سَعْد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ « لاَ يَكِيدُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَحَدٌ إِلاَّ انْمَاعَ كَمَا يَنْمَاعُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ ». (الحديث ١٨٧٧)[٢٧١].

سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی فڕو فێڵ لە خەڵکی مەدینە بکا، وەك خوێ ناو ئاو دەتوێتەوە. (تاج/٢/٢٨٣ ز/١٤١).

**خودایە ئەوەی فڕو فێڵ لەخەڵکی ئەم کوردستانە موبارەکەش دەکا وەك خوێی ناو ئاو بەزویی بیتوێنەرەوە، ئامین) ٢٠٠٣/٧/١٠.**

٨٦٣– عن أُسَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ أَشْرَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ الْمَدِينَةِ فَقَالَ « هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى إِنِّي لأَرَى مَوَاقِعَ الْفِتَنِ خِلاَلَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ ». (الحديث ١٨٧٨، أطرافه ٢٤٦٧، ٣٥٩٧، ٧٠٦٠)[٢٧٢].

ئوسامە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر قەلایێ لەقەلاکانی مەدینەوە سەرنجی داو فەرمووی: ئەرێ ئەوەی من چاوم لێیەتی ئێوەیش چاوتان لێیەتی؟ گوتیان: نەء، فەرمووی: دەسا من دەبینم فیتنەو ئاشوبو بگرەو بەردەو کوشتنو بڕین وەکوو دڵۆپی لێزمەی باران لەناو کووچەو ماڵەکانتان دادەبارێن! ئەوە بوو وابوو، لەپاش مەرگی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرتەنە بەرپا بوو وەك کەری دەروێش سەری دەکرد بەهەموو ماڵێکا، بە کوشتنی ئیمام عوسمان دەستی پێکرد. (تاج/٤/٣٧٠ ز/١١٣ ف/٣).

---

[٢٧١] اخرجه مسلم في الحج، باب: من أراد أهل المدينة بسوء الله، رقم: ١٣٨٧.

[٢٧٢] اخرجه مسلم في الفتن وأشراط الساعة، باب: نزول الفتن كمواقع القطر، رقم: ٢٨٨٥.

٨٦٤- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ رُعْبُ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، لَهَا يَوْمَئِذٍ سَبْعَةُ أَبْوَابٍ، عَلَى كُلِّ بَابٍ مَلَكَانِ ». (الحديث ١٨٧٩، طرفاه ٧١٢٥، ٧١٢٦)[٢٧٣].

ئەبو بەكر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموی: ئەو سامو ترس و لەرزەو تۆقینە، كە جەجاڵی جادوو گەری هەڵاتباز لەسەر ڕووی زەوی بەرپای دەكا نایەتە ناو مەدینەوە، لەو ڕۆژگارەدا مەدینە حەوت دەرگای هەیە هەر دەرگایەك دوو فریشتەی بە دیارەوەیە. (تاج/٢/٢٨٢ ز/١٤١ -١-ش) + (تاج/١٠/٣٠٥ ز/١١٠ -١- هەتا ل/٣٥٠).

٨٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). « عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ ». (الحديث ١٨٨٠، طرفاه ٥٧٣١، ٧١٣٣)[٢٧٤].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لەسەر هەموو كووچەو شەقامێكی مەدینە فریشتە ڕاوەستاون، ئێشكی دەگرن لەبەر ئەوە نەتاعونو نە جەجاڵ ناچنە ناوی. (تاج/٢/٢٨٢ ز/١٤١ ف/١).

٨٦٦- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلاَّ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، لَيْسَ لَهُ مِنْ نِقَابِهَا نَقْبٌ إِلاَّ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ صَافِّينَ، يَحْرُسُونَهَا، ثُمَّ تَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ، فَيُخْرِجُ اللَّهُ كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ ». (الحديث ١٨٨١، أطرافه ٧١٢٤، ٧١٣٤، ٧٤٧٣)[٢٧٥].

---

[٢٧٣] وهذا الحديث من افراده (عيني/١٠/٢٤٢). المترجم.

[٢٧٤] اخرجه مسلم في الحج، باب: صيانة المدينة من دخول، رقم: ١٣٧٩.

[٢٧٥] اخرجه مسلم في الفتن واشراط الساعة، باب: قصة الجاسة، رقم: ٢٩٤٣.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: جەجالْ دەچێتە ناو هەموو ولاتێ، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ هەمووی رێو بانەکانی مەدینە سێ جار دەهەژێو دانیشتووەکانی رادەوەشێنێو سێ لەرزە دەکا، جا لەسەری لەرزەی سێیەما ئیتر هەرچی کافرو موونافیقە کەوان لەناو شاری مەدینەدا، بەهۆی ئەو سێ بوومەلەرزەیەوە خودا لەمەدینە دەریان دەچێنێو دەچن بۆلای جەجالْ، ناو مەدینە تەنیا موسوڵمانی پاکی تیادا دەمێنێ، ئەوانیش جەجالْ زیانیان پێ ناگەیەنێ. (تاج/٢/٢٨٢ ز/١٤١ ف/٢-ش).

٨٦٧- عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَدِيثًا طَوِيلاً عَنِ الدَّجَّالِ، فَكَانَ فِيمَا حَدَّثَنَا بِهِ أَنْ قَالَ « يَأْتِي الدَّجَّالُ - وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ - بَعْضَ السِّبَاخِ الَّتِي بِالْمَدِينَةِ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ، هُوَ خَيْرُ النَّاسِ - أَوْ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ - فَيَقُولُ أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ، الَّذِى حَدَّثَنَا عَنْكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) حَدِيثَهُ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، هَلْ تَشُكُّونَ فِي الأَمْرِ فَيَقُولُونَ لاَ. فَيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يُحْيِيهِ فَيَقُولُ حِينَ يُحْيِيهِ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطٌّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّى الآنَ فيريد أن يَقْتُلَهُ فلا يُسَلِّط عَلَيْهِ». (الحديث ١٨٨٢، طرفه ٧١٣٢)[٢٧٦].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدرێژی باسی جەجاڵی بۆکردین، لەناو باسەکەدا (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموی: جەجالْ کەدێ لێی قەدەغەکراوە کە لەدەربەندەکەی مەدینەوە ڕەت بێو بچێتە ناو شاری مەدینەوە، جا کەبێ بۆ مەدینە دێ تا دەگاتە لای شورەکاتەکانی دەرەوەی مەدینەو لەوێ باروبنەی لی دەخا، جا لەو رۆژگارەدا پیاوێ فەرمووی: (لە چاترینی ئادەمیزادی ئەو

---

[٢٧٦] اخرجه مسلم في الفتن واشراط الساعة، في صفة الدجال تحريم المدينة عليه، رقم: ٢٩٣٨.

رۆژەیـە) پێـی دەڵـێ: گـەواهیو شـایەتی دەدەم کـە تـۆ ئـەو جەجاڵـەی کـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) باسـی ئـەوی پـێ گوتـوین، جـەجاڵیش دەڵێ: ئایا پێم بڵێن ئەگەر ئەم پیاوە بکوژمو لەپاشا زینـدووی بکەمـەوە، ئـیتر هـیچ گومانێکتـان دەمێنـێ لـەکاروباری مـن دا، کـە خـودای ئێـوەم؟: دەڵـێن: گومانمان نامێنێو دەیسەلمێنین فـەرمووی: جا دەیکوژێو لەپاشان زیندوشی دەکاتەوە، پیاوەکەیش کە جەجاڵ زیندووی دەکاتەوە پێی دەفەرموێ: بـەخودا هەرگیز وەك ئێستا بەتەواوی لێم روون نەبۆتەوە کە تۆ جـەجاڵی، جا جاری دووەم دەیـەوێ بیکوژێتـەوە بـەڵام لـەخوداوە دەسـەڵاتی ناشـکێ بەسـەریدا. (تاج/٢/٣٢٣ ز/١١٣ ش- ف/٢).

٨٦٨– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) جَاءَ أَعْرَابِيٌّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فَبَايَعَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ، فَجَاءَ مِنَ الْغَدِ مَحْمُومًا، فَقَالَ أَقِلْنِي، فَأَبَى ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَقَـالَ « الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ، تَنْفِي خَبَثَهَا، وَيَنْصَعُ طَيِّبُهَا ». (الحديث ١٨٨٣، أطرافـه ٧٢٠٩، ٧٢١١، ٧٢١٦، ٧٣٢٢)[٢٧٧].

جـابیر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: عـەرەبێکی دەشـتەکی هاتـە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەیعەتو پەیمانی پێ دا لەسەر ئیسلامەتی، وە بۆ سبەینێ هاتەوە تادار بوو، بەپێغەمبەری گوت: پەیمانەکەم هەڵوەشێنەرەوە، ڕێگەم بدە بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم، ئاوو هـەوای ئێـرەم پـێ ناکـەوێ، وە سـێ جـار ئـەم داوایـەی لەپێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) داواکرد، وە هەرسـێ جارەکـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) داواکـەی قـەبوڵ نـەکرد، لەگـەڵ ئەوەیـشا کـابرای دەشـتەکی شـاری بـەجێ هێـشتو پەیمانەکەی شکاند، جا خۆشەویـست (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) فەرمووی: مەدینە وەك مووشەدەمە وایە، چۆن موشەدەمەو کوورە چڵكو ژەنگـی ئاسـنو زێڕو زیو لادەبەنو جەوهـەری کانزاکـە دەردەخـەنو شـەوقی پـێ هەڵدەهێنن

[٢٧٧] اخرجه مسلم في الحج، باب: تسمية المدينة طابة، صم/٩ ص/١٥٥ –المترجم.

مەدینەش ئاوەها پیاوی خراپی ناوی ڕەهەنە دەکاو، پیاو باشانی ناوی پەروەردە دەکاو شەوقیان پێ هەڵدەهێنێ. (تاج/٢/٢٧٧ ز/١٣٨ -٣-ش/ت).

٨٦٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَيْ مَا جَعَلْتَ بِمَكَّةَ مِنَ الْبَرَكَةِ ». (الحديث ١٨٨٥)[٢٧٨].

لەئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودایە! دووقاتی مەککە پیتو فەڕیان بۆ بخەرە مەدینەوە.

٨٧٠- عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - قَالَتْ لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهِ وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ الْحُمَّى يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ يَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مَجَنَّةٍ وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

قَالَ اللَّهُمَّ الْعَنْ شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَعُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، كَمَا أَخْرَجُونَا مِنْ أَرْضِنَا إِلَى أَرْضِ الْوَبَاءِ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ ». قَالَتْ وَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، وَهْيَ أَوْبَأُ أَرْضِ اللَّهِ. قَالَتْ فَكَانَ بُطْحَانُ يَجْرِي نَجْلاً. تَعْنِي مَاءً آجِنًا. (الحديث ١٨٨٩، أطرافه ٣٩٢٦، ٥٦٥٤، ٥٦٧٧، ٦٣٧٢)[٢٧٩].

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ خۆیو یارانی تەشریف دەبەن بۆ مەدینە،

---

[٢٧٨] اخرجه مسلم في الحج، باب: فضل المدينة ودعاء النبي فيها بالبركة، رقم: ١٣٦٩.

[٢٧٩] اخرجه مسلم في الحج، باب: الترغيب في سكنى المدينة والصبر، رقم: ١٣٧٦.

ئەبو بەكرو بیلال نەخۆش كەوتن‌و تووشی پەتا بوون‌و ئاوو هەوای ئەوێیان پێ نەكەوت، جا ئەبو بەكر لەرزووتاكە دەیگرت دەیگوت:

كُـــلُّ امْـــرِئٍ مُـــصَبَّحٌ فِـــي أَهْلِـــهِ    وَالْمَـــوْتُ أَدْنَـــى مِـــنْ شِـــرَاكِ نَعْلِـــهِ

واتە:

**گـــەرتۆ لـــەناو كـــەس‌و كـــاری    گـــەر لـــەلادێ، گـــەر لەشـــاری**
**كـــە مـــردن هـــات نییـــە چـــاری    سەرچـــاوانە دیـــاری بـــاری!**

فەرمووی: بیلالیش كە تاكەی بەری دەدا، دەستی دەكرد بە لۆرە لۆرو سۆزكردن‌و دەیگوت:

أَلاَ لَيْـــتَ شِـــعْرِي هَـــلْ أَبِيـــتَنَّ لَيْلَـــةً    بِـــوَادٍ وَحَـــوْلِي إِذْخِـــرٌ وَجَلِيـــلُ
وَهَـــلْ أَرِدَنْ يَوْمًـــا مِيَـــاهَ مَجَنَّـــةٍ    وَهَـــلْ يَبْـــدُوَنْ لِـــي شَـــامَةٌ وَطَفِيـــلُ

واتە:

**نـــای نەمردمایـــە، شـــەوێ لەشـــەوان    شەوارەم دەگرت لەگردی سەیوان**
**مەست دەبوم لەبۆی گوڵی نەرخەوان    لـــەمن دەردەكـــەوت چـــیای بـــەرانان**

بـــیلال دەیـــشی فـــەرموو: لەعنـــەت‌و نـــەفرەتی خـــودا لەشـــەیبەی كـــوڕی رەبیعـــەو لەعوتبـــەی كـــوڕی رەبیعـــەو لەئومەییـــەی كـــوڕی خەڵـــەف كەئـــەم ستەمكارانە ئێمەیان لەناو خاك‌و وڵاتی خۆمانەوە وەدەرنـاو ناچاریان كـردین كە كۆچ بكەین بۆ ئەم وڵاتە پەتاوییە.

لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: « اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ ».

ئـەی خودایـە! مەدینـەمان لـەلا خۆشەویـست بكـە، وەك مەككـە یـاخود خۆشەویـستریش، ئـەی خودایـە! پیـت‌و فـەڕو بەرەكـەت بڕێـژە بەسـەر مـەن‌و مشت‌و میوەو دانەوێڵەمانا وە تەندروستی‌و لەشی ساغ بـدە بـە دانیـشتوانی‌و

بەشاری، ساخڵەمو سازگار بۆمان، وەناسازیو ناساغییەکەشی بگوێزەرەوە بۆ جەحفە.

عائیشە دەفەرموێ: کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، ئەو ساکە ناسازترین وڵاتی خودا ئەوێ بوو، شیوێ بوو طحان جمەی دەهات لەسییانو چڵکاو!. (تاج/٢/٢٨٤ ز/١٣٢-١).

## پایانێ

مامۆستا عەسقەلانی لەپایانی نامەی فەضڵو گەورەیی مەدینەدا دەفەرموێ: ئەم باسە (٢٦) فەرموودەی لەخۆ گرتووە، چواریان بێ ڕشتەن، تەعلیقن، واتە: هەڵواسراو نۆیان دووبارەن، پوختەتەکەیان (٢٦-٩=١٧) حەڤدە فەرموودەیە، شێخی موسلیمیش هەموویانی تەخریج کردووە، جگە لەمانەیان:

١- فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە سەبارەت بەباسی خێڵی نەوەی حاریثە (٨٥٥ ت = ١٨٦٩ ف).

٢- فەرموودەکەی ئەبو بەکرە لەبارەی باسی جەجاڵەوە، (٨٦٤ ت = ١٨٧٩ ف).

هەروا دەفەرموێ: یەك بیسراو (أثر)یشی واتیا، کە بیسراوەکەی عومەرە، کە جارێ بەمەوصوڵیو جارێ بەبێ ڕشتە تەخریج کراوە.

لەتەجریدەکەدا حەڤدە فەرموودە پوختەکە هەیە، کەلەژمارە (٨٥٤)ەوە هەتا (٨٧٠) چونکە (٨٧٠-٨٥٣ = ١٧).

شیعرەکەی ئیمام ئەبوبەکر بەپەخشان واتە:

هەموو کەسێ سەر لەبەیانی، بەیانی باشی لێ دەکرێو کەسوکاری پێی دەڵێن بەیانیت باش، ڕۆژ باش، دووریش نییە کەمردن لەپەنا گوێیابێ، لەقەیتانی پێڵاوەکانی لێی نزیکتر بێ.

شیعرەکانی حەزرەتی بیلالیش بە پەخشان واتە:

خۆزگـه دەمزانـی کـه ئایـا جـاری تـر، وەك جـاران لەشـیوی لەشـیوە دڵگیرەکانی مەککەی نیشتمانی خۆم، شەودەکەمەوە.

وە بـۆنو بەرامـەی گیـاو گـوڵو گوڵزارەکـانی ئەوخاکـه خۆشـه دێتـەوە بەسەرما، وەك گیانی سرِناتكو گیای (ثومامه).

ئایا دەبێ جاری تر رێم بکەوێتەوە سەرکانیو کارێزەکەی مەجیننه، کەوا نـزیك بازاڕی عوکاظ بوو، ئایـا دەبـێ چیای شـامەو چیای طـوفـەیل ببینمـەوە کەدوو چیان لەچیاکانی مەککه.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٣٦- نامەی رِۆژوو (كتاب الصوم)

٨٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ « الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَجْهَـلْ، وَإِنِ امْـرُؤٌ قَاتَلَـهُ أَوْ شَـاتَمَهُ فَلْيَقُـلْ إِنِّـى صَائِمٌ. مَرَّتَيْنِ، وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَـهْوَتَهُ مِـنْ أَجْلِـى، الـصِّيَامُ لِـى، وَأَنَـا أَجْـزِى بِـهِ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا ». (الحـديث ١٨٩٤، أطرافـه ١٩٠٤، ٥٩٢٧، ٧٤٩٢، ٧٥٣٨)[٢٨٠].

ئـەبوهورەیرە (رِەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درودی خـوای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: خـودای گـەورە لەفەرموودەیـەکی قودسـیدا دەفەرموێ: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتیو بەشـی دنیـایی خـۆیی پێوە هەیە، بێجگە لەرِۆژوو بەڵام رۆژوو ساخ بـۆ منـه، لەبـەر ئـەوە مـن خـۆم پاداشـی دەدەمـەوە، وە رِۆژوو قەڵغانـەو مـەردوم دەگێرِێتـەوە لەخراپـەو دەبـێ

---

[٢٨٠] اخرجه مسلم في الصيام، باب: حفظ اللسان للصائم، وباب: فضل الصيام، رقم: ١١٥١.

بەحەساری ئاگری دۆزەخ! جا هەر رۆژێ بەرۆژوو بوون قسەی پڕوو پوچو شاتە شات مەکەن، ئەگەر یەکێکیش جنێوی پێدان، یا شەڕی پێ فرۆشتن بڵێن من بابایەکی بەڕۆژووم شەڕە جمێن و شەڕکردن بۆ من نەهاتووە بەزمانی بەڕۆژووەوە دەمی خۆم چەپەڵ ناکەم!.

بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە بەڵخی دەمی ڕۆژووەوان لەلای خودا لەبۆنی میسك خۆشترە. ڕۆژووەوان لەبەر خاتری من واز لە خواردن و خواردنەوەو لەهەموو ئارەزووی خۆی دەهێنێ، هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد چەند قات پاداشی دەدرێتەوە، چاکەیش یەك بەدەیە، هەتا یەك بەحەوت سەدیش هەیە، بەڵکوو زیاتریش. (تاج/٦٩/٢ ز/٢٦ ف/١ + ریاض الصالحین/٩٠٦/٣-٢١٧ ف/١)، (بروانە:١ ژ/٨٧٧).

٨٧٢- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَقُومُونَ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ ». (الحديث ١٨٩٦، طرفه ٣٢٥٧)[٢٨١].

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دەرگایەك هەیە لەبەهەشتا ناوی دەرگای تێراوە، لەڕۆژی قیامەت دا تەنها ڕۆژووەوانەکان لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوەو بەس، فریشتەی ڕەحمەت بانگەواز دەکەن ڕۆژووەوانەکان کوان لەکوێن؟ جا ئەوانیش دەڕۆن لەو دەرگایەوە دەچنە ژوورەوە کە دواکەسیان دەچێتە ژوورەوە ئیتر ئەو دەرگایە دادەخرێ و کەسی تری لێوە ناچێتە ژوورەوە. (ریاض/٩٠٩/٣ ز/٢١٧ -ش + تاج/٧٢/٢ ز/٢٥ ف/٤ - ش/ن).

---

[٢٨١] اخرجه مسلم في الصيام، باب: فضل الصيام، رقم: ١١٥٢.

٨٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ نُودِيَ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللّٰهِ، هَذَا خَيْرٌ. فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ ». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللّٰهِ، مَا عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا قَالَ « نَعَمْ. وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ ». (الحديث ١٨٩٧، أطرافه ٢٨٤١، ٣٢١٦، ٣٦٦٦)[٢٨٢].

له ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ جووتێ شت لەرێگەی خودا دا ببەخشێ وەك ئەوە دوو درەم، یا دوو ماین، یا دوو گا، یا وەك ئەوە مەڕو بزنێ، یا کەواو کراسێ، یا هەنێ شەکرو چای ببەخشێ کاتێ کە دەچێتە بەهەشت دەرگاوانەکان بانگی دەکەن ئەی بەندەی خودا! ئەی فیسارە کەس! ئەم دەرگایە باشە لەباوەڕی من دا، فەرموو وەرە لێرەوە بچۆرە ژوورەوە!.

جا ئەوەی خاوەنی نوێژە لەدەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خاوەنی خەباتو غەزابێ لەجیهان دا بەغەزاوە ناوی جوانی دەرکردبێ، لە دەرگای خەباتو غەزاوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خاوەنی ڕۆژووبێ لەدەرگای تێراوو پاراوەوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خێرەو مەندبێ لەدەرگای خێرەومەندانەوە بانگ دەکرێ، ئیتر هەروا هەموو کردەویەکی باش دەرگای تایبەتی خۆی هەیە، ئەبوبەکری صەدیقیش (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی قوربان! ئەی پێغەمبەری خوا! بەباوكو دایکمەوە بەقوربانت بم، خۆ قەیدی نییە کە کەسێ لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێ؟

[٢٨٢] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: من جمع الصدقة واعمال البر، رقم: ١٠٢٧.

خۆشەویست باوکم دایکم بەقوربانی بێ فەرمووی: بەڵێ هەیە لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ دەکرێ، وە ئومێد دەکەم کە تۆ ئەی ئەبو بەکر! یەکێك بیت لەوان!. (ریاض الصالحین/٣/٩٠٨ ز/٢١٧ ف/٢).

٨٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ ». (الحديث ١٨٩٨، طرفاه ١٨٩٩، ٣٢٧٧)[٢٨٣].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ کە ڕەمەزان دێت هەموو دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە ڕەحمەت دەبارێ. (تاج/٢/٧١ ز/٢٥ ف/٢ ش/ت/ن).

وعَنْهُ فِي الرِوايَة أخرى: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « إِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ ». (الحديث ١٨٩٩).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ کە مانگی ڕەمەزان تەشریف دەهێنێ، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەبارێ. دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەکان کۆتو زنجیرو کەلەپچە دەکرێن. (ریاض/٣/٩١٠ ز/٢١٩ ف/٦ -ش).

٨٧٥- أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ « إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ ». وَقَالَ غَيْرُهُ عَنِ اللَّيْثِ حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ وَيُونُسُ لِهِلَالِ رَمَضَانَ. (الحديث ١٩٠٠، طرفاه ١٩٠٦، ١٩٠٧)[٢٨٤].

---

[٢٨٣] اخرجه مسلم في الصيام، باب: فضل شهر رمضان، رقم: ١٠٧٩.

[٢٨٤] وفقه مسلم على تخريجه، (شم/٧/١٨٨) باب: وجوب صيام رمضان برؤية الهلال. المترجم.

ئيبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەیفەرموو : تامانگی نوێ نەبینن نەبیکەن بەڕەمەزانو نەبیکەن بەجەژن! ئەگەر هەورو هەلاش بوو، وە هەور بەری مانگی گرتبوو، سیی ڕۆژی تەواو دابنێن بۆ مانگی پێشوو. (تاج/٢/٨١ ز/٢٩ — ش/د/ت/ن).

٨٧٦– عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِى أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ ». (الحديث ١٩٠٣، طرفه ٦٠٥٧)[٢٨٥].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو ڕۆژووەوانەی کەلەقسەی ناڕەواو کاری ناڕەوا واز نەهێنێ خودا کاری بەوەی ئەو نییە کە ڕۆژ تا ئێوارێ دەمی خۆی ببەستێ وەنانو ئاو نەخوا، گوایە بەڕۆژووە ئەوە لەمانگرتن زیاتر دەچێ هەتا لەڕۆژوو. (ریاض/٣/٩١٩ ز/٢٢٣ ف/٢).

٨٧٧– عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « قَالَ اللَّهُ كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِى، وَأَنَا أَجْزِى بِهِ. وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ، وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ، فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ، أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ إِنِّى امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ، وَإِذَا لَقِىَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ ». (الحديث ١٩٠٤)[٢٨٦].

وەرگەڕاوەکەی لەژمارە ٨٧١ دا رابورد، لەکۆتایی ئەم فەرموودەیەدا دێ دەفەرموێ: ڕۆژووەوان لەدووکاتا شادو کەیف خۆش دەبێ لەکاتی بەربانگا

---

[٢٨٥] لم يوافقه مسلم غلى تخريجه، (فتح/٤/٢٤٩ — خاتمة كتاب الصوم). المترجم.

[٢٨٦] اخرجه مسلم في الصوم، باب: فضل الصيام، رقم: ١١٥١.

شادو کەیف خۆش دەبێ، وە لەو کاتەشدا کە دەچێتەوە خزمەتی خودا بەهۆی ڕۆژووەکەیەوە تەواو کەیف خۆش دەبێ. (تاج/٢/٧٠ — ش/د/ت/ن).

٨٧٨– عن عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) فَقَـالَ كُنَّـا مَـعَ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ « مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالـصَّوْمِ، فَإِنَّـهُ لَـهُ وِجَـاءٌ ». (الحـديث ١٩٠٥، طرفـاه ٥٠٦٥، ٥٠٦٦)[٢٨٧].

عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەت دا بووین فـەرمووی: ئـەی دەسـتەی لاوان! ئـەی گـەلی جوانـان! هەرکەسـتان تـەوانایی سـەرجێی‌و ژنـداریی هەیـە بـا ژن بهێنـێ چـونکە هاوسـەرگرتن چـاوی مـرۆڤ تێردەکاو داوێنی لەتاوان دەپارێزێ.

ئەوکەسەی لەکێشیا نییە هاوسـەر بگـرێ، بـا بـەڕۆژوو بـێ، چـونکە ڕۆژوو دەیخەسـێنێ، واتـە: ئـارەزووی کـەم دەکاتـەوە، تـا خـوا دەرووی لـێ دەکاتـەوە. (تاج/٣/٤٨ ف/١ ز/٢٢ — ش/د/ت/ن).

٨٧٩ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَالَ « الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً، فَلاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَـأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلاَثِينَ ». (الحديث ١٩٠٧)[٢٨٨].

عەبـدوڵلای کـوڕی عومـەر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مـانگ بیـستو نـۆ ڕۆژیـش دەبـێ، خـۆ مەرج نییە کە گشت مانگێ سیی ڕۆژی ڕێك بێ، تا مانگی یـەك شـەوە نـەبینن نەبیکەن بە ڕەمەزان‌و نە بیکەن بەجەژن! ئەگەر هـەورو هـەڵا بـوو، وە هـەور

---

[٢٨٧] اخرجه مسلم في النكاح (عيني/١٠/٢٨٧، صم/٩/١٧٢)، باب: استحباب النكاح لمن تاقت نفسه اليه وجد مؤنة. المترجم.

[٢٨٨] اخرجه مسلم في الصيام، باب: وجوب صوم رمضان لرؤية الهلال رقم: ١٠٨٠.

بەری مانگی گرتبوو، سیی رۆژی تەواو دابنێن بۆمانگی پێشوو، ئەوسا بیکەن بەڕەمەزان یا بیکەن بەجەژن.

٨٨٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ - رضى الله عنها - أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آلَى مِنْ نِسَائِهِ شَهْرًا، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا غَدَا أَوْ رَاحَ فَقِيلَ لَهُ إِنَّكَ حَلَفْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ شَهْرًا. فَقَالَ « إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْمًا ». (الحديث ١٩١٠، طرفه ٥٢٠٢)[٢٨٩].

ئوممو سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێکیان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لەژنەکانی کەیەك مانگ نەچێتە لایان، کەبەمە لەزاراوەی شەرعی شەریفا دەگوترێ: (ئیلاء)، جا لەپاش بیستو نۆ رۆژ سەر لەبەیانی یا سەر لەئێوارە پێغەمبەر چوو بۆلای خێزانەکانی کە پێیان گوت خۆ تۆ سوێندت خوارد بوو کەیەك مانگ نەچیت بۆلایان؟ فەرمووی: مانگ بیستو نۆ ڕۆژیش دەبێ خۆ مەرج نییە کە گشت مانگێ سیی رۆژی دەق بێ. (تاج/٢/٨٢ ز/٢٩ ف/٤ — ش/ت/ن).

٨٨١- عن أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم « شَهْرَانِ لاَ يَنْقُصَانِ شَهْرَا عِيدٍ رَمَضَانُ وَذُو الْحَجَّةِ ». (الحديث ١٩١٢)[٢٩٠].

ئەبو بەکرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: دوو مانگی دوو جەژنە واتە مانگی رەمەزانو مانگی قوربان بەدەگمەن رێ دەکەوێ هەردوو مانگەکان لەیەك ساڵا لە سیی رۆژ کەمتر بن، بەڵکوو زۆرینەی کات یا هەردوو مانگەکان سی تەواو دەبن یا ئەگەر یەکێکیان بیستو نۆ بوو ئەوی تریان سیی تەواو دەبێ.

---

[٢٨٩] اخرجه مسلم في الصوم، عيني/١٠/٢٨٣. صم/٧/١٩٤، باب: النهي عَنْ تقديم رمضان بصوم يوم. المترجم.

[٢٩٠] اخرجه مسلم في الصيام، باب: معنى قوله (صلى الله عليه وسلم) شهرا عيد لاينقصان، رقم/١٠٨٩.

٨٨٢- عن ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا. يَعْنِي مرة تسعة وعشرين، ومرة ثَلاَثِينَ». (الحديث ١٩١٣)[٢٩١].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێمە گەلێکی نەخوێندەوارو بێ سەوادین، نووسینو ئەستێرە ژمێریی نازانین، مەگەر زۆر کەم جا لەبەر ئەوە خودای میهرەبان بەپێی حاڵ نیشانەی ئاسانو ئاشکرای بۆ داناوین، بۆ زانینی کاتی طاعەتو پەرستشو کاروباری ترمان وەك دیتنی خۆرو دیتنی مانگی یەك شەوە هەموو مانگێکیش مەرج نییە سیی ڕۆژی تەواو بێ مانگی وا دەبێ ئەوەندەیەو وادەبێ ئەوەندەیە واتە: ڕێ دەکەوێ مانگ بیستو نۆ ڕۆژ دەبێ وەڕێ دەکەوێ مانگ سیی ڕۆژی تەواو دەبێ. (تاج/٢/٨٢ ز/٢٩ ف/٣ — ش/د/ن).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودانە وەردەگیرێن:

١- ئاماژەو ئیشارەت بایەخی خۆی هەیە بۆ ڕونکردنەوەی مەبەست، وەك بڵێ: خاوەری ژنم تەڵاقی کەوتبێت بەدەستیش بەدوو پەنجە ئامازە بکات، ئەوە دوو تەڵاقی دەکەوێ.

٢- زانستی ئەستێرە ژمێری زانستێکی وردو بایخدارە مانگ جاری وا دەبێ بیستو نۆ ڕۆژە جاری وایش دەبێ سیی ڕۆژی ڕێکە.

٣- بەپێی فەرمودەکان، سەری مانگ بەسێ شێوە دەچەسپێ:

أ- بەبینینی مانگ یەك شەوەی مانگی نوێ.

ب- ئەگەر هەورو هەڵا بوو مانگ نەبینرێ، سیی ڕۆژی تەواو دادەنرێ بۆ مانگی پێشوو ئەوجا دەبێ بەیەکی مانگی دواتر.

---

[٢٩١] أخرجه مسلم في الصيام، باب: وجوب صوم رمضان لرؤية الهلال، رقم: ١٠٨٠.

جـ- بەپێی حیسابی فەلەکی، کە ئەمڕۆ زۆر بەئاسانی دەتوانرێ کە سەری مانگی تازە زۆر بەوردی دیاری بکرێ.

لەبەر گرنگی ئەم مەبەستە حەزدەکەم بە ئیقتیباس لەپەڕاوی (کیف نتعامل مع السنة) کە دانراوی (د.یوسف قەرزاویە) ئەم باسە روون بکەمەوە، چونکە لەو بڕوایەدام کەکاتی ئەوە هاتووە لەم بابەتە گرنگەدا سوود لە حیسابی فەلەکیش وەربگیرێ، پێشەکی لەغایەتولئوصوولی شەرحی تاجول ئوصولا لەبەرگی دووەم لاپەڕە پەنجاو پێنج دا دەفەرموێ:

جەماوەری زانایان دەفەرموون: بایەخ بەقسەی ئەستێرە شوناسو حیسابگەر نییە... بەلام شەرعزانە شافیعییەکان دەفەرموون: حیسابو ژمێریاریی ئەمانە بایەخی هەیە، چ بۆ خۆیانو چ بۆ ئەوانەی کە باوڕیان پێ دەکەنو حیسابەکەیان بەڕاست دەزانن، لەبەر ئەوە بۆیان هەیە کە کار بەقسەکەیان بکەن، چونکە ئەم فەرموودانە دەق نین لەسەر کارنەکردن بە حسابی حساب گەڕان، بەلکوو بەپێچەوانەوە ئاماژە بۆ ئوە دەکەن کە حیسابگەری زانستێکی دانسقەی بایەخدارە، کە بەهەموو کەسێ نازانرێ وەکی تریش نوێژ کە هاوتای رۆژووە، بە ئیتفاقی نەتەوەی ئیسلام کاتەکانی بەپێی حیساب دیاری دەکرێ لە قورئانیش دا ئایەتێ بەدەق پەسەنی ئەو زانایانە دەکا کە بەهۆی ئەستێرەوە شارەزایی شایان لە بابەتەکان دا پەیدا دەکەن کە بەدەق دەفەرموێ: {وَعَلامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ} (النحل /١٦).

لە موغنی موحتاجیش دا ئامازە بۆ ئوە دەکا کە بەلای نەوەویو سوبوکیو زەرکەشییەوە جۆرە بایەخێ بۆ حیسابگەری دادەنرێ.

لێرەدا ئێمە فیقهی مەقاصید رەچاو دەکەینو بۆمان هەیە کەبلێین شەرعزان بۆی هەیە کە بفەرموێ لەم فەرموودانەدا مەبەست دیاری کراوە کە گرتنی رۆژووی مانگی رەمەزانە سەرانسەری بەبێ کەمو زیاد بەبێ لێ کەلکردن.

هۆكارێكی لەباریش لەگەڵ بارودۆخی ئەو رۆژگارەدا دیسان دەستنیشان كراوە، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە نەگۆڕە، كەئەو هۆكارە بینینی مانگی نوێیە بەچاوی سەر، لەلایەن یەك شایەتەوە یا لەلایەن چەن شایەتێكەوە ئەم هۆكارەیش هۆكارێكی ئاساییە كە بۆ هەموو سەردەمێ دەست دەدا، جەماوەری خەڵك بەئاسانی دەتوانن بەهرەی لێ وەربگرن.

دیارە كەلەسەردەمی بەختەوەری دا كە چاخی پێغەمبەرییە بینینی مانگی نوێ بەچاوی سەر بەبێ دووربین‌و تەلەسكۆب‌و شتی تری وا یەكەم هۆكاری ئاسانی ئاسایی لەباری ئەو رۆژگارە بووە، كە بۆ هەموو كەسێ دەستی داوە، لەسەر ئەوە فەرموودەكەش ئەوی (واتە: بینینی) دەستنیشانكردووە بۆ گەیشتن بەو مەبەستە گرنگە، چونكە نەدەكرا كە لەنەتەوەیەكی بێ سەوادی وەك نەتەوەی ئیسلام لەوكات‌و ساتەدا داوای كاركردن بە حیسابی فەلەكی لێ بكرێ بۆ دیاریكردنی هاتنی سەری مانگ، چونكە شتی واو داوای وا، لەو سەردەمەدا بۆ ئەوان‌و لەوان كاری كەس نەكردەیی بووە! تووشی سەراسێی دەكردن.

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا منی كردووە كە ببم بە مامۆستایەكی نەرمونیان بۆیان، كار ئاسان بكەم بۆ ئۆمەتم، خودا منی بۆئەوە ڕەوانە نەكردووە كە مەردووم تووشی ڕەنج‌و سەراسی بكەم‌و باری سەرشانیان قورستر بكەم‌و ئەركیان گرانتر بكەم.

دەی باشە ئێمە دەڵێین: راستە مەبەست لێرەدا نەگۆڕە، بەڵام هۆكار شایانی گۆڕانە، لەزاتی خۆیدا، مەبەستە نە بەشێكە لەمەبەست بەڵكوو پەیژەو هۆكارە بۆ گەیشتن بەمەبەست هەروەك چۆنن لەكۆن دا وڵاخی سواری باشترین هۆكار بووە بۆ گەیشتن بەمەبەست كە حەجكردنە بەڵام هۆكاری باشتر پەیدابووە وەك فڕۆكەو خۆشڕۆ.

دەی کەوایە هەرکاتێ هۆکاری تری باشتری لەبارتر پەیدا بوو بۆ گەیشتن بەمەبەستی دیاریکردنی سەری مانگ کە کراوە بەئامانج و مەبەست لەم فەرموودانەدا، کە ئەو هۆکارە بەشێوەیەکی وابێ، هەم هەڵەی کەمتر بێ هەم ئاسان تربێ هەم راستتر بێ هەم لەتوانا دابێ، ئیتر بۆ دەبێ ئێمە خۆمان شەتڵ بکەین بەهۆکارە کۆنەکەوە بۆ دەبێ خۆمان لەئامانجی سەرەکی فەرموودەکان هەڵە بکەین و کوێرانە خۆمان شەتەك بدەین بەڕوو کەشکارییەوە!.

بێگومان ئەمڕۆ لەسایەی خواوە، شۆڕشی زانست هەموو سەر ڕووی زەوی گرتۆتەوە بەر سوپاس بۆ خودا ئەمڕۆ گەلی ئیسلام رۆشنبیرە پڕە لە زانای پایە بەرز لەهەموو بوارەکان دا پڕە لەپسپۆڕانی لێهاتووی لێزان زانای ئاسمانی و زەمین ناس و دەریاناسی وامان هەیە پسپۆڕن لەسەر جیهانی ئێستا بەهۆی رادارو تەلەسکۆب و شتی تری واوە تەنێکی بچکۆلەی زۆر لەمانگ دوور ترو بچووکتر لەقولایی ئاسمان دا شوێن و دووری و چەندی و چۆنی دیاری دەکرێ، بەڵێ ئێستا وەك جاران نەماوە ئەمڕۆ مرۆڤ لەسەر رووی گۆی مانگ گەشت و گوزرا دەکا، نموونەی بەردو چەوو خاك و خۆڵی سەرمانگی هێناوە بۆ سەر زەوی گەلێ بەئاسانی دەتوانێ سەری مانگ بە تەلەسکۆب و هۆکاری ئاسمانشوناسی نوێ دیاری بکرێ گەلێ راستترو بەهێزتر لەبینینی مانگی نوێ بەچاوی سەر لەلایەنی چەند کەسێکی کەمەوە کە دوور نییە تەنکە هەورێ یان تارماییەکیان لێ بووبێ بەمانگی یەك شەوە.

ئەوە کە گومانی تیادا نییە هەرکاتی بە تەلەسکۆب و شتی وا چەسپا کە مانگی نوێ لەپاش نوێژی خەوتنان بەپێی کاتی مەککە لەدایك دەبێ ئەوە هەرکەسێ لافی ئەوە لێ بدا کە ئەو ئێوارەیە لەمەککە یەکسەر لەپاش خۆرئاوا بوون مانگی دیوە ئەوە درۆیەکی پەتی دەکا هۆشی ساخ و بەڵگەی راست و دروست بەدرۆ دەخاتەوە گەرچی قازی لەسەر شایەتیی ئەویش

بڕیاری هاتنی مانگی نوێ دەربکا(*) چونکە ئەم هۆکارە تازانە لەچاو ئەو هۆکارە کۆنانەدا هەر خوایان یەکە، بەڵگەیەکی بێ هەڵەی بێ فڕو فێڵن لەهەمان کاتا زۆر بەئاسانی دەتوانرێ ڕۆژانی ڕەمەزان و ڕۆژانی جەژن و بۆنەی پیرۆزەکانی تر یەك بخرێن، لەهەموو وڵات و نیشتمانی ئیسلام دا پێکەوە ڕۆژوو بگیرێ، یا جەژن بکرێ، دەتوانرێ چارەسەری ئەم پەرتی و سەرگەردانییەی ئێستا هەیە بەئاسانی بکرێ، چونکی ساڵی وا هەیە جەژن لەوڵاتێ تەواو دەبێ ئەوسا لەوڵاتێ تر دەست پێ دەکا، ئەمساڵ کە (٢٠٠٢)یەکی ڕەمەزان لەلیبیا سێ شەممە بوو، لەزۆرینەی وڵاتە ئیسلامییەکانی تر چوار شەممە بوو، لەپاکستان و ئێران یەکی مانگ پێنج شەممە بوو!.

گەرچی ئەم وەزعە زۆرتر سیاسەت و سیاسەتمەدارەکان دروستیان کردووە بەڵام ئەگەر شەرعزانەکان لایەنگیریان نەکەن ئەوان ناتوانن سەربەخۆ شتی وا بسەپێنن بەسەر خەڵکا.

دەی شتی وا نەدین پێی خۆشە نە هۆشی ساخ پەسەندی دەکا، نەزانست پشتگیری لێ دەکا، لە ڕاستی دا ئەمڕۆ حیسابی فەلەکی باشترین هۆکارە بۆ

(*) لەیادمە جارێ قازی سوننی و قازی جەعفەری و بەڕێوەبەری (الدائرە الفلکیە) لەبەغداد، لەپێش ڕەمەزانا نەدوەیەکیان گرت لەم بابەتە دووان، دوا پرسیار کە لەبەڕێوەبەری فەرمانگەی ئاسمانشوناسی کرا، کەوا دەزانم ناوی (قدامە الملاح)بوو ئەمە بوو: ئەم شەو مانگی نوێ لەدایك دەبێ یانا؟ گوتی: بەبێگومان ئەم شەو سەعات دوازدەی شەو بەکاتی بەغدا، لەفلانە وڵات لەدایك دەبێ، ئەویش واتای وایە کەمانگ بەپێی ئاسۆی عێراق، ئەم ئێوارەیە لەپێش خۆردا ئاوا دەبێ، واتە: بەهیچ شێوەیەك ئەم ئێوارەیە مانگ بەچاوی مرۆۆ لەعێراق نابینرێ، کەچی قازی بەغدادی ئەووەل کەناوی (مامۆستا عبدالقادر ئیبراهیم) بوو فەرمووی: ئێمە ئەم ئێوارەیە لەدادگای شەرعی دادەنیشین، ئەگەر شایەتی بەیاخدار هاتن و شایەتییان دا کەمانگمان دیوە، بەیانی دەیکەین بەڕەمەزان، هەقمان بەسەر حیسابی فەلەکییەوە نییە، قازی جەعفەریش هەروای گوت. وەرگێڕ.

ساخكردنەوەی سەری مانگ، کەواتـە دەبـێ بەقیاسـول ئـەولا، کـار بـەم هۆکـارە نوێیە بکرێ، چونکە لەشوێنێ شەرع ڕێگە بـدا مەبەستـێ بـەهۆکارێکی نـزمتر ساخ ببێتـەوە وەك بەچاوی بیـنین بـێ، لـەم مەسـەلەی بەردەسـتمان دا کـە هەڵدەگرێ بەهەڵە دا بچێ، دەی لە جێگەیێ کە شـەرع ڕێگـەی هۆکاری وا بـدا ئـیتر چۆن ڕێگە لـە هۆکـارێکی چاکتری بـێ هەڵـەتر دەگـرێ، کەلەسـەدا سـەد مەبەستەکە مسۆگەر دەکا، لەهەمان کاتـا جیهانی ئیسلامی لەگێـژاوەیی فـرە جەژنیو شتی تری وا ناقۆلا ڕزگاری دەبێ.

مامۆستای موحەدیثو فەرمووەزانی گەورە عەللامـە شێخ ئەحمەشـاکیر (ڕەحمەتی خودای لـێ بـێ) لەساڵی ١٩٣٩ دا دەفـەرموێ: کـارکردن بـە حیسـابی فەلـەکی لـەم سـەردەمەدا ڕێـك بـەپێی دەقـی سوننەتی پێغەمبـەر خۆیـەتی نەوەك بەپێی شتێکی تر.

وەلەسـەر ئـەم شێوەیە ئـەم بڕیـارە ساخ دەکاتـەوە کەدەفـەرموێ: بڕیـاری چەسپاندنی سەری مانگی نـوێ، بـەهۆی چاوی سـەرەوە عیللـەتو بایـستەکەی لەناو سوننەت دا بەدەق گوتراوە کەئەمەیە: (إنا أمة أمية لا نكتب ولا نحسب، الـشهر هكـذا وهكـذا) کەبـە وردی سـەرنجی فـەرمووده سـەر بەڵگـەکانی ئـەم مەسەلەیە دەدەین ئەمەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە بۆیە ئێستا ئێمـە کـار بـەدیتن بەچـاو دەکـەینو کـار بەزانـستی ئاسمـان شوناسـی ناکـەین، چـونکە لـەم سەردەمەدا نەتەوەی ئیسلام گـەلێکی بـێ سـەوادی نەخوێنـدەوارن، لەبەرئـەوە نـاتوانن بـەهۆی زانـستی شوناسیەوە هـاتنی مـانگی هـەیقی شـەهری قەمـەری دیاری بکەن، دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیـەو واتـای وایـە: کەهـەر کاتـێ نەتـەوەی ئیسلام ڕۆشنبیر بوون زانـاو خوێنـدەواری باشیان تیا پەیـدا بـوو، کـە بتـوانن بەحیسابی فەلەکی هاتنی مانگی نوێ بـسەلمێنن ئـیتر ئـەو بایـستە نامێنـێ بـۆ دیاری کردنـی سـەری مـانگ بـەهۆی بیـنین بەچـاو دەی ئـەوەتانێ سـوپاس بـۆ خودا ئەمڕۆ نەتەوەی ئیـسلام لەزانـستی ئاسمـان شوناسـی دا زۆر پێـشکەوتووە

ئەم زانستەیش ئێستا بووە بە زانستێکی بەرێزی بەسوودی رێکو پێك یاساو دەستووری دامەزراوی خۆی هەیە کە بەسەدان ئامێرو تاقیگەو پسپۆڕ کاری تیا دەکەن، وەك جاران نەماوە کە پیاوی فێڵبازو فاڵچی حیسابگرو شتی تری وا لافی غەیبزانی پێوە لێ بدەن..!.

لەڕاستی دا بۆ ماوەیەکی زۆر کەم بەتایبەتی لەدەوروبەری سەردەمی پێغەمبەر دا ئەم جۆرە گێلە پیاوانە بوو بوون بەهۆی دابەزینو پەستیی پلەو پایەی ئەم زانستە مەزنە، گەرچی هەتا ئێستایش بنەبڕ نەبوونو هەر رۆژەی بەناوێکەوە لەناو کۆمەڵە ساویلکەکان دا سەرهەڵ دەدەن!.

بەڵێ، ئەمڕۆ لەسایەی خوداوە رۆڵەکانی ئیسلام ویاربوونەتەوە زۆر بەوردی دەتوانن بەپێی زانستی ئاسمان شوناسیو ئامێری فرە پێشکەوتووی تازە یەکەم چرکەی سەرەتای مانگی نوێی هەیڤی هەموو مانگێ لەساڵا بەبێ هەڵە دیاری بکەن، وە ئەمە راستەقینەیەکی بەلگە نەویستە، خۆ لێگێلکردنی ئەو پەڕی گێلییە. کەواتە: بەلایەنی کەمەوە دەبێ ئێمە کار بەیەکێ لەم دوو یاسایە بکەین، بەهۆکاری ئاسمان شوناسی یاخود بەبینینی مانگی یەك شەوە بەچاو کار بەهەردوولا بکەین.

دووەم: ئەگەر بەپێی حیسابی فەلەکی نەدەگونجا کە مانگ بەچاو ببینرێ، دەبێ قازی شایەتی لەکەس لەم بارەیەوە وەرنەگرێ، چونکە بەلگە بەپێی شەرع کاتێ باوەڕ کاری پێ دەکرێ، کە هەستو هۆشو شەرع بەدرۆی نەخەنەوە، دەی لەباری وادا هەستو هۆش شایەتی وا پووچ دەکەنەوە.

ئیمامی سوبوکی (ت ٧٥٦هـ) کە یەکێکە لە گەورە کۆششکار (موجتەهید)ەکانی مەزهەبی شافیعی، لەفەتواکانی دا باسی ئەوە دەکا ئەگەر بەپێی حیسابی فەلەکی مەودا نەبوو بۆ بینینی مانگ، وەك ئەو ئێوارەیە لەو شوێنە مانگ لەپێش خۆردا ئاوا ببێ، ئەوە پێویستە لەسەر قازی کەشایەتی شایەتەکان وەرنەگرێ.

لەموغنی موحتاج دا ئەم گوتەی سوبوکییە ئاوا راگویز دەکات:

(لو شهد برؤية الهلال واحد أو الإثنان واقتضى الحساب عدم امكان رؤيته، قال السبكي رحمه الله تعالى لا تقبل هذه الشهادة لأن الحساب قطعي والشهادة ظنية والظني لايعارض القطعي... الخ).

واتە: ئەم شایەتییە وەرناگیرێ، چونکە حیسابی فەلەکی بەلگەیەکی بڕەڕی بەلگە نەویستە، بڕیارەکەی راستەو بەبێگومانە، بەلام قسەی شایەتەکان هەواڵە هەواڵیش هەڵدەگرێ راست بێ هەڵ دەگرێ درۆبێ، کەواتە لەو جۆرە بەلگانەیە کە گومانی هەڵەی لێ دەکرێ، دەی بەلگەی گومانیی چۆن بەلگەی بڕر رەد دەکاتەوە، چ جای ئەوەی پێش ئەو بخرێ..!.

مامۆستا شاکیر دەفەرموێ: مامۆستا شێخ مستەفای مەراغی کە شێخی زانکۆی ئەزهەری شەریف بوو کاتێ سەرۆکی دادگای باڵای شەرعی بوو، رای وەك ئیمامی سوبووکی وابوو (ڕەزای خوای لێ بێ) هەروەها دەفەرموێ: ئەم مەسەلەیە بەر ئەو یاسا ئوصولییە دامەزراوە دەکەوێ، کە بڕیاردەدا بڕیار بە بوونو لەگەڵ بایستەکان دا دەسووڕێ، (الحكم يدور العلة وجوداً وعدماً).

مامۆستای عەینیش پاش رونکردنەوەیەکی دورو درێژ دەفەرموێ: کاتێ بۆمان هەیە لەزانستی ژمارە گەری تێ روانین کەشتەکە زۆر روونو ئاشکرا بێ یا وەك ئاشکرا وابێ...

دەی بێگومان لەم سەردەمەدا کە ساڵی (٢٠٠٢)ی زایینییە، کارەکە گەیشتۆتە پلەی بێگومانیو بەلگە نەویست.

مامۆستای مەلا عەبدلکەریمی مودەریسیش لەشەریعەتی ئیسلام دا دەفەرموێ: رەمەزان بەقسەی حیسابگەرو ئەستێرە ژمێر لەسەر خۆیانو لەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان پێ دەکەن دەچەسپێ.

بڕوانــه: ئــهم سهرچــاوانه، عمــده القــارئ شــرح صــحيح البخــارى، ج/١٠ ص/٢٨٧، شهريعهتى ئيسلام/٢٤١/١، مغنى المحتاج/٤٢١/١، كيف نتعامل مع السنه، د.قهرزاوى ص/١٤٥، فتح البارى ج/٤ ص/١٢٧).

٨٨٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ « لاَ يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَـوْمٍ أَوْ يَـوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُـونَ رَجُـلٌ كَـانَ يَـصُومُ صَوْمَهُ فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الْيَوْمَ ». (الحديث ١٩١٤)[٢٩٢].

ئەبو هورەيرە (ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ) لەحەزرەتەوە (درووودى خواى لەسـەر بىٚ) دەفەرموىٚ: بەرۆژوو دوو ڕۆژ لەپێش ڕەمەزانا بەرۆژوو مەبن، مەگـەر بـۆ كەسىٚ ڕۆژووى خۆى بگرىٚ، وەك ئەوە كەسىٚ دەسـتوورى وابـىٚ، دوو شـەممانو پێنـج شەممان بەرۆژوو بىٚ، يا ڕۆژووى نەزر بىٚ، يا قـەزا بـىٚ. (تـاج/١٢١/٢ ز/٥٤ – ش/د/ت).

٨٨٤- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّـدٍ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمًا، فَحَضَرَ الإِفْطَارُ، فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلاَ يَوْمَهُ، حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِمًا، فَلَمَّا حَضَرَ الإِفْطَـارُ أَتَى امْرَأَتَهُ، فَقَالَ لَهَا أَعِنْدَكِ طَعَامٌ قَالَتْ لاَ وَلَكِنْ أَنْطَلِقُ، فَأَطْلُبُ لَـكَ. وَكَـانَ يَوْمَـهُ يَعْمَلُ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ خَيْبَةً لَكَ. فَلَمَّـا انْتَـصَفَ النَّهَـارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ( أُحِلَّ لَكُـمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَـى نِـسَائِكُمْ ) فَفَرِحُـوا بِهَـا فَرَحًـا شَـدِيدًا، وَنَزَلَـتْ ( وَكُلُـوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَـيْطِ الأَسْـوَدِ ). (الحـديث ١٩١٥، طرفه ٤٥٠٨)[٢٩٣].

---

[٢٩٢] اخرجه مسلم في الصيام، باب: لاتقدموا رمضان بصوم يوم ولا يومين، رقم: ١٠٨٢.

[٢٩٣] لاحظ ما قال العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم، المترجم.

بـەراء (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: جـاران لەپێـشدا هاوڕێـیـانی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێ) لەپاش بەربانگ هـەر ئەوەنـدە مـاوەی خـواردنو خواردنـەوەیان هـەبوو هـەتا دەخـەوتن، جـا گریمـان ئەگـەر پیـاوێ بەڕۆژوو بووایەو بەربانگ ببوایەو پێش ئەوەی بـەربانگ بکاتـەوە خـەوی لـێ بکەوتایە ئیتر دەبوو ئەو شەوەیش هەتا سبەی ئێوارێ بەڕۆژوو بوایـەو هیـچی نەخواردایەو ڕۆژووی نەشکاندایە جا ڕۆژێ قەیـسی کوڕی صیرمەی ئەنـصاری بـەڕۆژوو دەبـێ کـە بـەربانگ دەبـێ بەژنەکـەی دەڵـێ: بـەربانگت لـەلا دەسـت دەکەوێ؟ دەڵێ: نـەء، بەڵام دەچم مشورێکت بۆ دەخۆم، قەیس ئـەو ڕۆژە ئـیش دەکاو مانـدوو دەبـێ، لەبـەر ئـەوە خـەو زۆری بـۆ دێنـێو خـەوی لـێ دەکـەوێ کاتێ کەژنەکەی دێتەوەو دەیبینێ وا خەوی لـێ کـەوتووە دەڵـێ: خانـە خـراپ چـیت بـەخۆت کـرد! جـا سـبەینێ لـەنیوەڕۆدا لەبـەر تـوینێتیو برسـێتیو ماندوویێتیو شەکەتی قەیس دەبوورێتەوە.

جا کاتێ ئەم باسـە گەیـشتەوە بـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَـاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ} (البقرة –١٨٧).

واتە: حەڵاڵ کرا بۆتان لەشەوانی ڕەمەزانا بچنە لای ژنەکانتان...

جـا ئەمـە مژدەیـەکی زۆر خـۆش بـۆ موسـوڵمانان وەئـەم ئایەتـەی تـریش هاتە خـوارەوە: {كُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ} (سورة البقرة –١٨٧).

واتـە: نـانو ئـاوبخۆن تـا سـپێدەی بـەیانیتان بـۆ جیـا دەبێـەوە لەڕشتەی تاریکی شەو. (تاج/٢/٧٧ ز/٢٧).

٨٨٥– عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ ( حَتَّـى يَتَبَـيَّنَ لَكُـمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ ) عَمَدْتُ إِلَى عِقَـالٍ أَسْـوَدَ وَإِلَـى عِقَـالٍ أَبْـيَضَ، فَجَعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ، فَلاَ يَـسْتَبِينُ لِـي، فَغَـدَوْتُ عَلَـى

رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْتُ لَهُ ذَلِكَ فَقَالَ « إِنَّمَا ذَلِكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ ». (الحديث ١٩١٦، طرفاه ٤٥٠٩، ٤٥١٠)[٢٩٤].

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خوای لێ بێ) کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ} بخۆن‌و بخۆنەوە تا هێڵی ڕەشی شەو لەهێڵی سپی ڕۆژ جیادەکەنەوە. کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە چووم پەتێکی ڕەش‌و سپیم هێنا، کەبەشەو دەخەوتم لەژێر سەرینەکەما دام دەنان، کەچی هەر تەماشای شەوم دەکرد، بەلاّم شەوی لەڕۆژ بۆ جیانەدەکرایەوە، جا ڕۆژێ چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزیم کرد ئەی پێغەمبەری خودا! من کە دەخەوم ئاوا دەکەم بەلاّم هیچم بۆ دەرناکەوێ؟ ئەویش فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): مەبەست لە خەیتی ئەبیەزو خەیتی ئەسوەد لە ئایەتەکەدا تاریکی شەوو روناکی ڕۆژە. (تاج/٢/٧٨ ز/٢٧).

٨٨٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ تَسَحَّرْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ. قُلْتُ كَمْ كَانَ بَيْنَ الأَذَانِ وَالسَّحُورِ قَالَ قَدْرُ خَمْسِينَ آيَةً. (الحديث ١٩٢١)[٢٩٥].

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پارشێومان کرد ئینجا لەخزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵساین چووین بەلای نوێژەوە، ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی عەرزی زەیدم کرد: نێوانی لێبوونەوەی لەپارشێوەکەو بانگی بەیانی چەندێ دەبوو؟ فەرمووی: بەقەد ئەوە دەبوو کە یەکێ بە خوێندنی

---

[٢٩٤] اخرجه مسلم في الصيام: باب: بيان أن الدخول الصوم يحصل بطلوع الفجر، رقم: ١٠٩٠.

[٢٩٥] اخرجه مسلم في الصيام، راجع الحديث ٣٣٦ في التجريد الذي سبق في ص/٣٣٨ من الجلد الأول من هذا الكتاب المبارك. المترجم.

ئاسایی نەخێرا نەسست پەنجا ئایەتی مامناوەندی نەکورت نە درێژ بخوێنێ. (ریاض/٣/٩١٤ ز/٢٢١ + تاج/٢/٨٧ ز/٣٢ ژ/٣٣٦. لەم کتێبە پیرۆزەیە کە لەپێشەوە لەبەرگی یەکەم دا رابوورد).

٨٨٧- عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً ». (الحديث ١٩٢٣ )[٢٩٦].

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پارشێو بکەن، چونکە بەرەکەت و پیت و فەڕو پیرۆزی وا لەپارشێودا. (ریاض/٣/٩١٤ ز/٢٢١ + تاج/٢/٨٦).

٨٨٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ رَجُلاً يُنَادِي فِي النَّاسِ، يَوْمَ عَاشُورَاءَ « أَنْ مَنْ أَكَلَ فَلْيُتِمَّ أَوْ فَلْيَصُمْ، وَمَنْ لَمْ يَأْكُلْ فَلاَ يَأْكُلْ ». (الحديث ١٩٢٤، طرفاه ٢٠٠٧، ٧٢٦٥ )[٢٩٧].

سەلەمەی کوڕی ئەکوع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی لەبەیانی رۆژی عاشورادا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە پیاوێ لەهۆزی ئەسلەم، کە بەمەردوم دا ئەم بانگەوازە هەڵ بداو پەخشەوە بکا، ئەی موسوڵمانینە! ئەوەی کە ئەمڕۆ شتی خواردووە، با ئیتر لەبیستنی ئەم بانگەوازەوە شت نەخواو ماوەی ئەمڕۆ تا ئێواری بەرۆژوو بێ، ومئەوەی کە ئەمڕۆ تا ئێستا شتی نەخواردوە با تائێواری شت نەخواو بەڕۆژوو بێ، چونکە ئەمڕۆ رۆژی عاشورایە، رۆژووکەی سوننەتێکی گەورەیە. (تاج/٢/١٢٦ ز/٦٠ + ریاض/٣/٩٢٤ ز/٢٢٧).

**راڤەو شیکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە پێنجەم فەرموودەیە لە فەرموودە سێ کەسییەکانی صەحیحی بوخاری کە ژمارەیان (٢٣) فەرموودەیە، رشتەکانی ئاوایە: (حدثنا

---

[٢٩٦] اخرجه مسلم في الصيام، باب: فضل السحور وتأكيد إستجابة رقم: ١٠٩٥.

[٢٩٧] اخرجه مسلم في الصيام، باب: من اكل في عاشوراء فليكف بقته بومه، رقم: ١١٣٥.

أوبو عاصم-١، عَنْ زيد بن أبي عبيد-٢، عَنْ سلمة بن الأكوع-٣) كه يەكەميان ژماره (٩٠) له تەجريدەكەدا، كه لەبەرگی یەكەما رابورد، كه ژمارەی (١٠٩)یه لەفەتحول باری دا، ئاخر فەرموودەی سیانی ژماره: ٧٤٢١ لەفەتحولباريدا وا له (كتاب التوحيد) فەرموودەی چوارەم له (باب: وكان عرشه عى الماء).

٨٨٩- عن عَائِشَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ. (الحديث ١٩٢٥، طرفه في ١٩٣٢ ، ١٩٣١، الحديث ١٩٢٦ طرفه في: ١٩٣٢)[٢٩٨].

عائیشەو ئوممو سەلەمه (ڕەزای خوایان لێ بێ) كه هەردووكیان هاوسەری پێغەمبەر بوون، دەفەرموون: شەوی وا دەبوو لەڕەمەزانا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵ حەلاڵو هاوسەری خۆی دا دروست دەبوو هەتا بەیانی لێ دەدا بەو لەش پیسییەوە دەمایەوە ئەوسا خۆی دەشۆردو لەكاتی ئاسایی نوێژی بەیانی دا نوێژی بەیانی دەكرد له هەمان كاتا ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبوو مەبەستی پێغەمبەر لەم كاره بەیانی جەواز بوو. (تاج/٢/١٠٤ ز/٤٤ + ریاض/٣/٩٢٠ ز/٢٢٤ ف/٤).

٨٩٠- عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ، وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لإِرْبِهِ. (الحديث ١٩٢٧، طرفه ١٩٢٨)[٢٩٩].

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڕۆژوو دەبوو، كەچی لەگەڵ ئەوەشا ماچو یاریو دەستبازی لەگەڵ حەلاڵی خۆیا دەكرد. واته: بەم جۆره شتانه ڕۆژوو ناشكێ. بەڵام كێتان وەك پێغەمبەری پێ دەكرێ، ئەو لەهەمووتان باشتر ئارەزووی خۆی پێ زەوت

---

[٢٩٨] اخرجه مسلم في الصيام، باب: صحة صوم من طلع عليه الفجر وهو جنب، رقم: ١١٠٩.

[٢٩٩] اخرجه مسلم في الصيام، باب: اكل الناس وشربه جماعة لايفطر رقم: ١١٥٥.

دەکرا، وە لەم لایەنەوە لەڕادە دەرنەچوو، لەبەر ئەوە تووشی بێ شەرعی نەدەبوو. (تاج/٢/١٠٣ ز/٤٢ — ش/د/ت/ن).

٨٩١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « إِذَا نَسِيَ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ ». (الحديث ١٩٣٣، طرفه ٦٦٦٩)[٣٠٠].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێ لەبیری نەبوو کە بەڕۆژووە، وە چێشتی خوارد، یا چێشتی خواردەوە ئەوە با ڕۆژووەکەی نەشکێنێ، ئەو نان و ئاوەش کە خواردوویەتی رزق و ڕۆزیەك بووە خوا بۆی ڕەخساندووە. (تاج/٢/١٠٠ ز/٤٠ ف/٢ — ش/د/ت/ن).

٨٩٢– عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْتُ. قَالَ « مَا لَكَ ». قَالَ وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا ». قَالَ لاَ. قَالَ « فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ ». قَالَ لاَ. فَقَالَ « فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا ». قَالَ لاَ. قَالَ فَمَكَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعَرَقٍ فِيهَا تَمْرٌ – وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ – قَالَ « أَيْنَ السَّائِلُ ». فَقَالَ أَنَا. قَالَ « خُذْهَا فَتَصَدَّقْ بِهِ ». فَقَالَ الرَّجُلُ أَعَلَى أَفْقَرَ مِنِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَوَاللَّهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا – يُرِيدُ الْحَرَّتَيْنِ – أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي، فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ثُمَّ قَالَ « أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ ». (الحديث ١٩٣٦، أطرافه ١٩٣٧، ٢٦٠٠، ٥٣٦٨، ٦٠٨٧، ٦١٦٤، ٦٧٠٩، ٦٧١٠، ٦٧١١، ٦٨٢١)[٣٠١].

---

[٣٠٠] اخرجه مسلم في الصيام، باب: اكل الناس وشربه جماعة لايفطر رقم: ١١٥٥.

[٣٠١] اخرجه مسلم في الصيام، باب تغليظ تحريم الجماع في شهر رمضان، رقم: ١١١١.

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لــێ بـێ) فـەرمووی: جـارێ لەخزمـەتی خۆشەویـست دا (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) دانیـشتبووین لەوكاتـەدا پیـاوێ هاتـە خزمـەتی، عـەرزی كـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! فـەوتاوم فـەرمووی: بۆچی فەوتاوی؟ گوتی لەڕەمەزانا بەڕۆژوو بـووم لەگەڵ ژنەكەم دروستبووم، فـەرمووی (دروودی خـوای لەسـەر بێ): ئایـا هەتـە كـە بەنـدەیێ ئـازاد بكـەی، لەكەفارەتی ئەو كارە ناشایستەدا كـە كردوتـە؟ گـوتی: نـەء، نیمـە، فـەرمووی: ئـەی دەتـوانی كـە دوو مـانگ لەسـەریەك بـەڕۆژوو بـێ؟ گـوتی: نـەء، نـاتوانم. فەرمووی: ئەی دەتوانی خـواردنی ژەمێكـی شەسـت هـەزار دابینكـەی‌و تێریـان بكـەی؟ وتـی: نـاتوانم. ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لــێ بـێ) فـەرمووی: جـا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لەشـوێنی خـۆی مایـەوە پیاوەكـەش لەخزمـەتی دا دانیـشت ئێمـەش هـەروا، هـەتا زەمیلـەیێ خورمایـان هێنـا بـۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: كوا پرسیار كەرەكە؟ گوتی: ئەمـەتام ئـەی پێغەمبـەری خـودا! فـەرمووی: ئەمـە بـەرە بیكـە بـەخێر، پیاوەكەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! كێ لەئێمـە پێویـستی زیـاتر هەیـە بەم زەمیلە خورمایە، هەتا پێی بدەم! دەسا بەو خودایە لـەم پـەڕی مەدینـەوە هـەتا ئـەو پـەڕی مەدینـە خێزانـێ شـك نابـەم كـە لەخێزانەكـەی مـن هـەژار تربـێ‌و وەكـوو خێزانەكـەی مـن پێویـستی بـەم خورمایـە بـێ! جـا پێغەمبـەر (دروودی خــوای لەســەر بــێ) وەهــا پێكــەنی تەنانــەت ددانەپێــشینەكانی دەركـەوت، ئینجـا فـەرمووی: دەبـڕۆ ئـەم خورمایـە دەرخـواردی خێزانەكـەی خۆت بدە. (تاج/٢/١٠٠ ز/٣٩ — ش/د/ت/ن).

٨٩٣— عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا) أَنَّ النَّبِـيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) احْتَجَمَ، وَهُوَ مُحْرِمٌ وَاحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ. (الحديث ١٩٣٨)[٣٠٢].

---

[٣٠٢] لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/٤/٢٤٩ — خاتمة كتاب الصوم) — المترجم.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام دا بەبەرگی ئیحرامەوە کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت وەلەکاتی بەرۆژوو بوونیشا هەروا کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت. (تاج/٢/١٠٤ ز/٤٥ ف/١+٢+٣).

**راڤەو شیکردنەوە:**

لەتاجدا دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەئیحرام دا بووە، کاتێ کەڵەشاخی لەسەری خۆی گرت، چونکە ژانە سەرێکی لەگەڵ دا بوو گەلێ جار لایێ سەری دەهێشا، پێی دەگوترێ شەقیقە. (تاج/٤/١٩٧ ز/٦١ ف/١+٢+٣+٤...تاد).

٨٩٤- عَنْ ابْنَ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي سَفَرٍ فَقَالَ لِرَجُلٍ « انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي » . قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ الشَّمْسُ . قَالَ « انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي » . قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ الشَّمْسُ . قَالَ « انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي » . فَنَزَلَ ، فَجَدَحَ لَهُ ، فَشَرِبَ ، ثُمَّ رَمَى بِيَدِهِ هَا هُنَا ، ثُمَّ قَالَ « إِذَا رَأَيْتُمُ اللَّيْلَ أَقْبَلَ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ » . (الحديث ١٩٤١، أطرافه ١٩٥٥ ، ١٩٥٦ ، ١٩٥٨ ، ٥٢٩٧)[٣٠٤].

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا لە خزمەتی پێغەمبەر دا بووین، بەرێگەوە دەرۆیشتین دنیا ڕەمەزان بوو، حەزرت (دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی بەڕۆژوو بوو، کاتێ خۆر ئاوا بوو، حەزرەت بەپیاوێکی فەرمووی: ئەی فیسارە کەس! ئادەی لە وڵاخەکەت دابەزە قاوتو ئاومان بۆ بکە، بەکەوگیرەکە باش تێی رادە تاباش ساف بێ. پیاوەکەیش (کە بیلال بوو) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هێشتا زووە، بابەتەواوی ببێ بەئێوارە خۆ ئەوە ڕووناکی خۆرە. پێغەمبەر (دروودی

---

[٣٠٤] اخرجه مسلم في الصيام، باب: بيان وقت انقضاء الصوم وخرج ..رقم:١١٠١.

خواى لەسەر بێ) دیسان فەرموویەوە: دابەزەو قاوتو ئاومان بۆ بگرەوە، گوتی: هێشتا هەر رۆژە، فەرمووی: دابەزە، قاوتو ئاومان بۆ بگرەوە. بیلالیش دابەزیو قاوتو ئاوی بۆیان کردو شەڵەقاندی دای پێیان، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خواردیەوە، لەپاشا فەرمووی: کە تەماشاتان کرد وا شەو لێرەوە داهات، ئیتر کاتی بەربانگی رۆژووەوانە. عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی ئاماژەی بۆ خۆر هەڵات کردو فەرمووی: ئەو لێرەوە دێ نەوەك لەخۆر ئاواوە!. (ریاض/٣/٩١٧ ف/٥ – ش).

٨٩٥– عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – زَوْجِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الأَسْلَمِيَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَأَصُومُ فِي السَّفَرِ وَكَانَ كَثِيرَ الصِّيَامِ. فَقَالَ « إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ ». (الحديث ١٩٤٣)[٣٠٤].

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوا لەپێغەمبەرو ڕەزای خودا لەعائیشەی هاوسەری بێ) فەرمووی: حەمزەی کوڕی ئەسلەمی پیاوێ بوو زۆر بەڕۆژوو دەبوو، عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لە سەفەردا بەڕۆژوو بم یانا؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە، حەزدەکەی بەڕۆژوو بە، حەزدەکەی بەڕۆژوو مەبە.

٨٩٦– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَرَفَعَهُ إِلَى يَدَيْهِ لِيُرِيَهُ النَّاسَ فَأَفْطَرَ. (الحديث ١٩٤٤، أطرافه ١٩٤٤، ٢٩٥٣، ٤٢٧٥، ٤٢٧٦، ٤٢٧٧، ٤٢٧٨، ٤٢٧٩)[٣٠٥].

---

[٣٠٤] اخرجه مسلم في الصيام، باب:التخير في الصوم والفطر، رقم: ١١٢١.

[٣٠٥] اخرجه مسلم في الصيام، باب: جواز الصوم والفطر في شهر رمضان للمسافر. رقم: ١١١٣.

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: لەسـاڵی ئـازادکردنی مەککەدا، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێ) لەمەدینـە لەگـەڵ سـوپایەکا بەرەو مەککە دەرچوون لەڕێ خۆی و سوپاکەی بەڕۆژوو بوون، هـەتا گەیـشتنە کەدید، لەوێ پێغەمبەر خۆی بەبەرچاوی لەشکرەکەوە بەسواری وڵاخەکەی ڕۆژووەکەی شکاند، ئیتر خەڵکەکەش ڕۆژووەکەیان شکاند.

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

لەساڵی هەشتو نیوی کۆچی دا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لەگەڵ سوپایەکی دەهەزار کەسی دا لـەدەی ڕەمـەزان دا لـەڕۆژی چوارشـەممەدا لەپاش نوێژی عەصر، لەمەدینە دەرچوون بۆ ئازادکردنی مەککە کە گەیـشتنە کێوی صەلصەل لەوێ جارچی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جاڕی دا: هەرکەسێ دەیـەوێ لـەم سـەفەرەدا لـەڕێ بـەڕۆژوو بـێ یا بـا بـەڕۆژوو بـێ، وە هەرکەسێ دەیەوێ بەڕۆژوو نەبێ با بەڕۆژوو نەبێ.

جا دەوری پێنج ڕۆژ بەڕێگەوە بـوون، لەسـەر ئـەم حاڵەتـە بـوون، هـەبوو بەڕۆژوو بوو، هەبوو بـەڕۆژوو نـەبوو، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) لـەم ماوەیـەدا بـەڕۆژوو بـوو، هـەتا گەیـشتنە کەدیـد، لـەوێ گەیـشتەوە بـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـە خەڵکەکـە ڕۆژووەکـە سـەغڵەتی کردوون، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) داوای جامێ ئـاو یـا شـیری کـرد بەسـەر پـشتی وڵاخەکەیـەوە جامەکـەی خـستە سـەر لـەپی تـا خەڵکەکـە بەباشی بینیان، ئـەوجا لەبـەر چـاوی ئـەوان ئاوەکـەی خـواردەوەو ڕۆژووەکـەی شـکاند، کـات پـاش نوێـژی عەصـر بـوو زۆربـەی خەڵکەکـەیش ڕۆژووەکـەیان شکاند، جا لەشکرەکە نۆزدەی مانـگ گەیـشتنە مەککە، واتـە دوروبـەری نـۆ ڕۆژ بەڕێوە بوون.

کەدید (لەسەر فەرمایشتی مامۆستای عەینی) ناوی شوێنێکی ناسراوە، لەسەر رێگەی مەدینە-مەککەیە، دەوری حەوت رۆژە ڕێ لە مەدینەوە دوورە، دەوری دوو رۆژە ڕێی دەمێنێ بۆ مەککە.

شێخی بوخاریش (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کەدید ناوی ئاوێکە وا لەنێوانی عوسفان‌و قودەیدا.

زولحەولەیفە ناوی درەختێ بوو، خەڵکی مەدینە لەلای ئەو درەختەدا ئیحرامیان دەبەست، ئێستا زولحەولەیفە ناوداره بەبیری عەلی، لە زولحولەیفە دوو مزگەوت هەیە.

یەکەمیان: مزگەوتی گەورەیە، کە موسوڵمانان لەوێ ئیحرام دەبەستن، ئەوی تریان مزگەوتی موعەررەسە، زولحولەیفە دوورترین شوێنی ئیحرام بەستنە، لەچاو شوێنەکانی تری ئیحرام بەستنی وڵاتەکانی تردا.

ئەم فەرموودەیە مورسەلی صەحابییە، چونکە ئیبن‌و عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) لەکاتی ئەم سەفەرەدا هێشتا لەمەککە لەگەڵ باوک‌و دایکی دا بوو هێشتا کۆچی نەکردبوو لەبەر ئەوە ئامادەی ئەم داستانە نەبووە، کەواتە: دیارە لەکەسێ تری بیستووە، بڕوانە: ژمارە پێنجی ئەم تەجریدە، کەوا لەسەرەتای بەرگی یەکەمی ئەم پەڕاوە پیرۆزەیەوە.

٨٩٧- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فِي يَوْمٍ حَارٍّ حَتَّى يَضَعَ الرَّجُلُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلاَّ مَا كَانَ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابْنِ رَوَاحَةَ. (الحديث ١٩٤٥)[٣٠٦].

ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا لەمانگی رەمەزانا دەچووین بۆ سەفەرێ، رۆژەکەی زۆر گەرم بوو، تەنانەت

---

[٣٠٦] اخرجه مسلم في الصيام، باب: التخيير في السفر، رقم: ١١٢٢.

پیاو لەتاو گەرما بەدەستی سێبەری بۆسەری دەکرد ئێمە هەموو بەڕۆژوو نەبووین، بێجگە لەپێغەمبەرو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) ناوی عووەیمیرە، ئەنصارییە، خەزرەجییە، ئەبو دەرداء لەچاو خزمانی خۆی دا کەمێ درەنگ موسوڵمان بوو، بەڵام موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو، لەگەڵ ئەوەدا پیاوێکی شەرعزانی هۆشیاری داناو زانا بوو، دەگێڕنەوە: پێغەمبەر لەپەسنو مەتحی ئەبو دەردائدا فەرموویەتی: ئەبو دەرداء داناو هۆشمەندی نەتەوە (ئومەت)ی منە. ئامادەی هەموو جەنگو غەزاکانی پاش غەزای ئوحود بووە، دووژنی هەبووە، هەردووکیان ناسراون بە ئومەو دەرداء، گەورەکەیان سەحابە بووە، ئومەو دەردائی بچکۆلە تابیعی بووە، ئەم فەرموودەیەی ئێرە ژنە تابیعییەکەی لە ئەبو دەردائەوە گێڕاویەتیەوە. ئەبو دەرداء چوار فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە. کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی موسوڵمانان دا برایەتی بەست لە نێوانی ئەوو سەلمانی فارسی دا. مەسرووق دەفەرموێ: ڕووبەڕوو گەلێ گوفتوگۆم لەگەڵ هاوەڵانی موحەممەدا کردووە سەرنجم داوە، زانستەکەیان هەموو لەلای ئەم شەش کەسەیان کۆوە بووە: (عومەر، عەلی، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، موعاز، ئەبو دەرداء، زەیدی کوڕی ثابیت) (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەبو زەڕ بە ئەبو دەردائی دەفەرموو: لەسەر ڕووی زەوی لەتۆ زاناتری تیا نییە ئەی ئەبو دەرداء. لەسەردەمی جێنشینی عوسمان دا بەدوو ساڵ لەپێش شەهید بوونی عوسمان دا ئەبو دەرداء مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەموویان بێ)، (بڕوانە: ژ/٤٦٨).

٨٩٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ - رضى الله عنهم - قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا، وَرَجُلاً قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ « مَا هَذَا ». فَقَالُوا صَائِمٌ. فَقَالَ « لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ ». (الحديث ١٩٤٦)[٣٠٧].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە ڕێبوارییەکدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدەوری پیاوێ قەرەباڵغییەکی دی، کە سێبەری بۆ کرابوو فەرمووی: ئەم جەنجاڵییە چییە؟ گوتیان ڕۆژووەوانە، ناوی ئەبو ئیسرائیلە، بەڕۆژووە، لەگەرماو لە توونیانا لەهۆش خۆی چووە، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ڕۆژوو لەسەفەردا کارێکی نا باشە. (تاج/٢/١٠٨ ز/٤٦ ف/٣+١+٢+٤+٥+٦).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

کورتو پوخت، بەکوردی پەتی لەسەفەردا بۆ کەسێ بتوانێ بەڕۆژوو بێ ڕۆژوو باشترە بۆ کەسێ پێی سەخڵەت بێ، بەڕۆژوو نەبێ باشترە.

٨٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ. (الحديث ١٩٤٧)[٣٠٨].

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران وادەبوو لەڕەمەزانا، لەخزمەتی پێغەمبەردا دەچووین بۆ سەفەر، جا نەڕۆژووەوان نەنگی لە ڕۆژوو شکێن دەگرت، لەبەر ئەوە کە بەڕۆژوو نییە، وە نەڕۆژوو شکێنیش نەنگی لەڕۆژووەوان دەگرت لەبەرئەوەی کە بەڕۆژووە.

٩٠٠- عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ ». تَابَعَهُ ابْنُ وَهْبٍ عَنْ عَمْرٍو. وَرَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ عَنِ ابْنِ أَبِي جَعْفَرٍ. (الحديث ١٩٥٢)[٣٠٩].

---

[٣٠٧] اخرجه مسلم في الصيام، باب: جواز الصوم والفطر في شهر ... رقم: ١١١٥.

[٣٠٨] اخرجه مسلم في الصيام، باب: جواز الصوم والفطر، رقم: ١١١٨.

عائیشه (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خۆشەویست و ئازیز، دەفەرموێ: کەسێ بمرێ و ڕۆژووی لەسەر بێ، کەس و کاری دەتوانن لەباتی ئەو بەڕۆژوو بن. (اج/٢/١١١ ز/٤٩ ف/١+٢+٣+٤+٥).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ڕۆژووەکە چ فەرز بێ و چ نەزر بێ و چ هی کەفارەت بێ، دروستە کەسوکاری مردووەکە بۆی قەزا بکەنەوە، ئەم بابەتە ڕاجیاییەکی دوورو درێژی تیادا هەیە، بەڵام ئەمە پوختەی فەرمایشتی دێرینی شافیعییە بەیهەقی و نەوەوی پشتگیری لێ دەکەن و بەهەڵبژاردەی دادەنێن و کاری پێ دەکرێ.

ئەم فەرموودەیە لە فەرموودە هەشتینەکانی صەحیحی بوخارییە، حەدیسی هەشتینە (ثماني) لە بوخاری دا کەمە، ڕشتەی ئەم فەرموودەیە ئەم کۆمەڵە زانیارییەی لەزانستی فەرموودە واتیادا.

١- ڕشتەکەی هەشتینەیە، لەنێوانی بوخاری و پێغەمبەردا هەشت کەس هەیە.

٢- لەسێ شوێنا (حدثنا)یە، بەشێوەی کۆ، لەیەك شوێنا (حدیث)ە بەشێوەی تاك.

٣- لەچوار شوێنا عەنعەنەی واتیا.

٤- کوڕ لەباوکیەوە گێڕانەوە دەکا.

٥- برازا لەمامیەوە گێڕانەوە دەکا.

٦- هەیە مامۆستاکەی نەیسابوورییە، هەیە مامۆستاکەی خۆراسانییە، هەیە میصرییە هەیە مەدینەییە، ڕشتەکەی خۆی ئاوایە:

بوخاری دەفەرموێ: {حدثنا محمد بن خالد حدثنا محمد بن موسى بن أعين حدثنا أبي عَنْ عمرو بن الحارث عَنْ عبيد الله بن أبي جعفر أن محمد بن جعفر حدثه عَنْ عروة عَنْ عائيشة (رضي الله عنها)}.

---

(٢٠٩) اخرجه مسلم في الصيام، باب: الصيام عَنْ الميت، رقم: ١١٤٧.

٩٠١– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ، وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا قَالَ « نَعَمْ – قَالَ – فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى ». (الحديث ١٩٥٣)[٣١٠].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم مردووە وەڕۆژووی مانگێکی لەسەرە، دەبێ کەمن خۆم بۆی بگێڕمەوە لەجیاتی خۆی؟ فەرمووی: (دروودی خوای لەسەر بێ) بەڵێ دەبێ.

ئەوجا خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) بەپیاوێکی فەرموو: پێم بڵێ ئەگەر دایکت قەرزاری کەسێ بێ وە تۆ ئەو قەرزەی بۆ بدەیتەوە، ئایا ئەوە برێتی قەرزەکەی دەکەوێ یا نا؟ گوتی: بەڵێ، برێتی دەکەوێ، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): کەواتە دانەوەی قەرزی خودا لە پێشترە!. (تاج/٢/١١١ ز/٤٩).

٩٠٢- فەرموودەی ژمارە: ٨٩٤ (أنزل فأجح لي) کە لەپێشەوە رابورد. (الحديث ١٩٥٥)[٣١١].

٩٠٣– عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ « لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ ». (الحديث ١٩٥٧)[٣١٢].

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: مەردووم هەتا پەلە لەبەر بانگ بکەن و بەربانگ بەقنگا نەخەن و لەکاتی خۆی دا رۆژوو بشکێنن، نیشانەی ئەوەیە کەهێشتا هەر باشن و لەڕای راست لایان نەداوە. (ریاض/٣/٩١٥ ز/٢٢٢ + تاج/٢/٨٨ ز/٣٢).

---

[٣١٠] اخرجه مسلم في الصيام، باب: قضاء الصيام عَنْ الميت، رقم: ١١٤٨.

[٣١١] (ر:٨٩٤).

[٣١٢] اخرجه مسلم في الصيام، باب: فضل السحور وتأكيد إستحبابه، رقم: ١٠٩٨.

٩٠٤- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَتْ أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ. (الحديث ١٩٥٩)[٢١٣].

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (ڕەزای خوا لەخۆیو ئەبو بەکری باوکی) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر دا (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆژێ ڕەمەزان بوو، بەڕۆژوو بوین ئێوارە هەرور هەلا بوو، وامان زانی کە خۆر ئاوا بووەو بووە بەشەو، ئیتر ڕۆژووەکەمان شکاند، کەچی پاش ماوەیێ خۆر وەدەرکەوت.

## راڤەو شیکردنەوە:

کورتو پوخت لەکاتی وادا قەزاکردنەوە پێویستە.

٩٠٥- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ أَرْسَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ « مَنْ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيَصُمْ ». قَالَتْ فَكُنَّا نَصُومُهُ بَعْدُ، وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا، وَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهُ ذَاكَ، حَتَّى يَكُونَ عِنْدَ الإِفْطَارِ. (الحديث ١٩٦٠)[٢١٤].

روبەیعی کچی موعەویز (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەر لەبەیانی ڕۆژی عاشوورا، پەیامی نارد بۆ گوندەکانی یاریدەران (الأنصار) کە ئەو گوندانە لە دەوروبەری مەدینە بوون، پەیامەکەی پێغەمبەر ئەمە بوو: هەرکەسێ ئەمرۆ بەڕۆژوو نییە، با ماوەی ئەمرۆ بەڕۆژوو بێ نەیشکێنێ. روبەیع فەرمووی: ئیتر لەوەدوا دەستوورمان وا بوو ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبووین، تەنانەت بەمندالی بچکۆلەی خۆیشمان

[٢١٣] لاحظ خاتمة كتاب الصوم في فتح الباري. المترجم.

[٢١٤] اخرجه مسلم في الصيام، باب: من اكل في عاشوراء فليكف بقية يومه، رقم: ١١٣٦.

ئەم رۆژووەمان دەگرت، بەوانەیان کە خودا لەچارەی نوسیبوون، وە دەچووین بۆ مزگەوتو یاریلۆکە (العوبة)مان لەخۆری رەنگاو رەنگ دروست دەکرد بۆیان، جاکە دەگریان بۆ نانو ئاو، بەو بووکلانە ژیرمان دەکردنەوە، هەتا کاتی بەربانگ. (تاج/١٣٦/٢/ ز/٦٠ — ش).

### راڤەو شیکردنەوە:

روبەیعی کچی موعەوویز (رەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لەو ژنانەی کە هاورێو سەحابەی پێغەمبەربوون ژنێکی بەرێزی ناوداره ئەنصارییه بەنی نەجارییە، واتە: لەهۆزی خاڵوانی پێغەمبەرە. موعەوویز دەفەرموێ: کە چووم بەبووکی، بەیانی شەوی بوکێنیم، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆ دێنیم. یەکێکە لەو ژنانەی کە لەژێر درەختی بەیعەتو ریضوان دا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەر دا ئامادەی هەندێ لەغەزاکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بووە، خۆی دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەر دا دەچووین بۆ غەزا، ئێمەی ژنان لەغەزادا ئیشمان ئەوە بوو ئاومان دەدا بە جەنگاوەرەکان، خزمەتمان دەکردنو شەهیدو زامدارەکانمان دەگواستەوە بۆ مەدینە جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) میوانی بوو کاتێ دەست نوێژی گرت، روبەیع خۆی ئاوی دەستنوێژەکەی دەکرد بە دەستی دا ئیبنو عەبباس بەتایبەتی چوو بۆ خزمەتی تا چۆنێتی ئەو دەست نوێژەی پێغەمبەری بۆ باس بکا. کۆمەڵێ شاگردی بووە، کە فەرموودەکانی ئەویان گێراوەتەوە، لەپەیرەوان (تابعین = چینی دووەمی موسوڵمان).

ئەم زاتانە گێرانەوەیان لێوە کردووە: سولەیمانی کوری یەسارو عەبادی کوری وەلیدو نافیعو خالیدی کوری زەکوانو کەسانی تریش، لەصەحیحی بوخاری دا سێ فەرموودەی هەیە ئەبو عوبەیدەی کوری موحەممەد دەڵێ:

عەرزی خاتوو روبەیعم کرد: چۆنێتی شێوەی پێغەمبەرم بۆ باس بفەرموو، فەرمووی: خۆرێکی هەڵهاتوو بوو بۆ خۆی!.

٩٠٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ « لاَ تُوَاصِلُوا، فَأَيُّكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ ». (الحديث ١٩٦٣، طرفه ١٩٦٧)[٣١٥].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەرم ژنەوتووە، دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەر بێ): نەکەن ڕۆژوو بدەنە دەم ڕۆژووی ترو دوو ڕۆژ یان زیاتر بەسەریەکەوە شەوو ڕۆژ بەڕۆژوو بن، شتی وا مەکەن، خۆ ئەگەر دنیا بوو کەسێ لەئێوە شتی وای کرد با هەتا بەرمبەیان شتی وابکا.

٩٠٧- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْوِصَالِ فِي الصَّوْمِ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « وَأَيُّكُمْ مِثْلِي إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ ». فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ « لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ ». كَالتَّنْكِيلِ لَهُمْ، حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. وعنه في رواية قال: إنّي أبيتُ يطعمني ربّي ويسقيني فاكلفوا من الأعمال ماتطيقون). (الحديث ١٩٦٥، أطرافه ١٩٦٦، ٦٨٥١، ٧٢٤٢، ٧٢٩٩)[٣١٦].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕێگەی نەدەدا کە کەسێ دوو ڕۆژ یا زیاتر شەوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێو لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێ ڕۆژووەکەی نەشکێنێ. هاوڕێیانی گوتیان: قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خۆت وادەکەی؟ فەرمووی: جا ئێوە وەك من وان، من جیام لەئێوە، من خودا فرسەتم دەداو، بەشەو نانو ئاوم دەداتێ، جا کە

---

[٣١٥] لم يخرجه مسلم (عيني ٧٣/١١ فتح الباري ٢٤٩/٤ خاتمة كتاب الصوم) المترجم.

[٣١٦] اخرجه مسلم في الصيام، باب:النهي عَنْ الوصال في الصوم، رقم: ١١٠٣.

هەروازیان نەهێنا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دوو ڕۆژ لەسەریەك نەیشكاند پێیان، هەتا مانگیان دیو بوو بەجەژن، ئیتر شكاندیان، فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئەگەر ئەم ئێوارەیە مانگ نەبینرایە، ڕۆژووی پەیوەستی پترم پێتان دەگرت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بۆیە وایكردو وای پێگوتن، وەك كەسێ بیەوێ چاو ترسێنیان بكا تا جارێكی تر شتی وا نەكەن.

لەگێڕانەوەیەكا: دووجار فەرمووی: نەكەن ڕۆژوو بدەنە دەم ڕۆژووی تر، گوترا: تۆ خۆت وادەكەی فەرمووی: من بەشەو لەخزمەتی پەروەردگارم دا دەبم، ئەو فرسەتم دەدا نانو ئاوم دەداتێ، ئێوە كارێ بكەن كەلە تواناتانا بێ، ئیشێ بگرنە ئەستۆی خۆتان كە بۆتان بكرێ. (تاج/٢/١٠٢ — ش/د/ت).

٩٠٨– عن أَبِي جُحَيْفَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ آخَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ سَلْمَانَ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَرَأَى أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً. فَقَالَ لَهَا مَا شَأْنُكِ قَالَتْ أَخُوكَ أَبُو الدَّرْدَاءِ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا. فَجَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ، فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا. فَقَالَ كُلْ. قَالَ فَإِنِّي صَائِمٌ. قَالَ مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ. قَالَ فَأَكَلَ. فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ. قَالَ نَمْ. فَنَامَ، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ. فَقَالَ نَمْ. فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ قَالَ سَلْمَانُ قُمِ الآنَ. فَصَلَّيَا، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ. فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « صَدَقَ سَلْمَانُ ». (الحديث ١٩٦٨، طرفه ٦١٣٩) [٣١٧].

ئەبو جوحەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەیمانی برایەتی بەست لەبەینی سەلمانو ئەبو دەرداندا، ڕۆژێ سەلمان دەچێ بۆ دێنی ئەبو دەرداو، دەڕوانێ ئوممو دەردائی خێزانی

---

[٣١٧] قال العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم، لم يخرج مسلم حديث ابي جحيفة في قصة سلمان وابي الدرداء، المترجم.

زۆر پەرپوتە، پێی دەڵێ: ئەوە بۆ وات لەخۆت کردووە؟ دەڵێ: ئەبو دەردائی برات کاری بەدنیا نەماوەو ئیشی بەژن نییە، ئیتر بۆکێ خۆم ئارایش بدەمو جلو بەرگی باش بپۆشم؟ ئەبو دەرداو هاتەوە نانی بۆ سەلمان دروستکردو نان دانرا، بەسەلمانی فەرموو نانەکەت بخۆ، من بەڕۆژووم سەلمان فەرمووی: دەی منیش نان ناخۆم تا تۆ نەخۆی. جا ئەویش خواردی کەشەو هات ئەبو دەرداو هەڵسایەوە بۆشەو نوێژ سەلمان پێی گوت: بخەومرەوە، لەدوایی شەودا سەلمان پێی فەرموو: دە ئێستا هەڵسە بۆ شەو نوێژ، ئیتر پێکەوە شەو نوێژیان کرد، لەپاشا سەلمان پێی فەرموو: لەڕاستی دا خودا مافی بەسەرتەوە هەیەو تۆی بۆ ئەوە دروستکردووە کەلەسەر شێوەیەکی جوان بی پەرستیت، وە هەروەها خۆت بەش بەحاڵی خۆت مافی حەسانەوەو حەوانەوت لەسەر خۆت هەیە، وە خێزانەکەت بەشی خۆی مافی هەیە لەسەرت، کەواتە هەموو خاوەن مافی خۆیی پێبدە، نابێ لەسەر حیسابی لایێ مافی لایەکی تر بفەوتێنی! ئەوجا ئەبو دەرداو دەچێ بۆلای پێغەمبەرو ئەمەی بۆ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سەلمان راست دەکا. (ریاض الصالحین/١/١٣٧ ز/١٤).

## باسەکانی رۆژووی سوننەتو هەندێ بابەتی تری رۆژوو

٩٠٩– عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ. فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِي شَعْبَانَ. (الحديث ١٩٦٩، طرفاه ١٩٧٠، ٦٤٦٥)[٣١٨].

---

[٣١٨] اخرجه مسلم في الصيام، باب: صيام النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في غير رمضان رقم: ١١٥٦.

عائيـشه (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: نـەم دیـوه كـه پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مانگێكی تەواو بـەڕۆژوو بـێ، بێجگـه لـه ڕەمـەزان، نەیشم دیوه كـه لـەهیچ مانگێـك بەقـەی مـانگی كوڵـەمانگ (مـانگی شـەعبان) بـەڕۆژوو بـێ، كۆوڵـەمانگی هـەموو دەگـرت كـەمێكی نـەبێ بگـره سـاڵی وابـوو هەمووی دەگرت، یەك ڕۆژی لـێ نەدەبوارد. (تاج/٢/١٣٠ ز/٦٢ ف/١).

٩١٠- وَعَنْهَا (رَضِي اللهُ عَنها) قَالَتْ لَمْ يَكُنِ النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) يَصُومُ شَهْرًا أَكْثَرَ مِنْ شَعْبَانَ، فَإِنَّهُ كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، وَكَانَ يَقُولُ « خُذُوا مِـنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَأَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى النَّبِيِّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) مَـا دُووِمَ عَلَيْـهِ، وَإِنْ قَلَّـتْ » وَكَـانَ إِذَا صَـلَّى صَـلاَةً دَاوَمَ عَلَيْهَـا. (الحديث ١٩٧٠)[٣١٩].

دیـسان عائیـشه (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕۆژووی سـوننەتی لـەهیچ مـانگێكی تـردا وەك مـانگی كوڵـه مانگ بەتەواوی نەدەگرت، چونكه زۆربـەی سـاڵ زۆرتـرین مـانگی كوڵـه مـانگ بـەڕۆژوو دەبـوو، پێغەمبـەر دەیفـەرموو: ئـەی موسـوڵمانینه! كـارێ بكـەن كـه لەتواناتانا هەبێ چونكه هەتا ئێوه وەڕس نەبن خودا وەڕس نابێ.

وه خۆشەویسترین نوێژی سوننەتیش لەلای پێغەمبەری خـودا ئـەو جـۆره نوێـژه سـونەتانه بـوو كـه بەبـەردەوامی دەكـرێن، بـا كـەمیش بـن، دەسـتووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابـوو كـه خـووی دەگـرت بـه نوێـژێكی سـوننەتەوه ئـیتر هەمیـشه بـەردەوام دەبـوو لەسـەری، نـەوەك ماوەیـێ بیكـاو دوایـی وازی لــێ بهێنــێ. (تـاج/٤/١٥٤ ز/٤٩ ف/١ + فـەرموودەی ژمـاره:٤٠ كـه لەپێشەوه رابوورد).

---

[٣١٩] اخرجه مسلم في الصيام، باب: صيام النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ) في غير رمضان، رقم: ٧٨٢.

**راڤەو شیکردنەوە:**

**فیقهی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە:**

ئەوەندە شتی سوننەت بگرە ئەستۆ کەهەتا سەر بە بەردەوامی بۆت بکرێ، نەکەی لەهەوەڵەوە زۆر لەشتێکی سوننەت ئەنجام بدەی‌و لەپاشا لەبەر زۆریکەی وازی لێ بێنی، کورت‌و پوخت کەمی بەردەوام چاترە لەزۆرێ کە زۆرینەی کات لەپڕا دەپچڕێ!.

٩١١– عن أنَسِ بنْ مالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) وَقَدْ سُئِلَ عَنْ صِيَامِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ مَا كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَرَاهُ مِنَ الشَّهْرِ صَائِمًا إلاَّ رَأَيْتُهُ وَلاَ مُفْطِرًا إلاَّ رَأَيْتُهُ، وَلاَ مِنَ اللَّيْلِ قَائِمًا إلاَّ رَأَيْتُهُ، وَلاَ نَائِمًا إلاَّ رَأَيْتُهُ، وَلاَ مَسِسْتُ خَزَّةً وَلاَ حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَلاَ شَمِمْتُ مِسْكَةً وَلاَ عَبِيرَةً أَطْيَبَ رَائِحَةً مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). (الحديث ١٩٧٣)[٣٢٠].

سەبارەت بە ڕۆژوو گرتنی سوننەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیار کرا، کە ڕۆژووی سوننەتی چۆن بوو؟ فەرمووی: شوێنێکی تایبەتی لەمانگ دیاری نەدەکرد بۆ ڕۆژوو، جاری واهەبوو لەسەرەتای مانگەوە بەڕۆژوو دەبوو، جاری وا دەبوو لەناوەڕاستییەوە یا لەکۆتاییەوە بەڕۆژوو دەبوو، لەبەر ئەوە لەهەر کوێی مانگەوە سەرنجت دەدا، جاری وا دەبوو بەڕۆژوو دەبوو، جاری وا دەبوو بەڕۆژوو نەبوو، بۆ شەو نوێژیش هەروا کاتی دیاریکراوی تەرخان نەدەکرد بۆ شەو نوێژ وەك سەرەتای شەو یا ناوەڕاستی یا کۆتایی لەبەر ئەوە لە کوێی شەوەوە سەرنجت دەدا، شەوی وا هەبوو لەوکاتەدا خەوتبوو شەوی وا دەبوو لەوکاتەدا هەڵسا بوو شەو نوێژی دەکرد.

---

[٣٢٠] بڕوانە ژمارە: ٥٦٩ کە لەبەرگی یەکەمدا رابورد. ورگێڕ.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) دەشی فەرموو: هەرگیز دەستم لەهیچ شتێ نەداوە (نەدیباج و نە ئاوریشم نەشتی تر) کە وەك دەستی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ئاوا نەرم و شل و ناسك و نازدار بێ، وە هەرگیزو هەرگیز بۆنی هیچ شتێکم نەکردووە (نەمیسك و نەعەنبەرو نەهیچی تر) کە بۆنی لەبۆنی پێغەمبەر خۆشتر بووبێ. (تاج/٢٥٩/٤ ف/١ ز/٨٥).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەو بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- ڕۆژووی سوننەت لەهەموو مانگێکا سوننەتە.

٢- ڕۆژووی نەفلی موتلق کاتی تایبەتی لە مانگا نییە.

٣- شەونوێژ لەهەموو بەشەکانی شەوا دەکرێن.

٤- ڕۆژووی سوننەتی پەتی (صەومی نەفلی موطلق) لەهەموو کاتێکی مانگا سوننەتە، مەگەر لەبەر هۆیەکی تایبەت نەیی لێ کرابێ، وەك گومانە ڕۆژوو نۆمینەی قوربان بۆ حاجی و ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنیا.

٥- لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێ کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ساڵ دونزە مانگە بەڕۆژوو نەبووە بەڵکوو ناو بەناو بەڕۆژوو بووە، نەك ساڵ دوانزە مانگە.

٩١٢- عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « يَا عَبْدَ اللَّهِ أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ ». فَقُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ « فَلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلَّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ ». فَشَدَّدْتُ، فَشُدِّدَ عَلَيَّ، قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً. قَالَ « فَصُمْ صِيَامَ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ وَلاَ تَزِدْ عَلَيْهِ ». قُلْتُ وَمَا كَانَ صِيَامُ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - قَالَ « نِصْفَ الدَّهْرِ ». فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقُولُ

بَعْدَ مَا كَبِرَ يَا لَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ١٩٧٥، راجع رقم: ٥٦٤ ت + ١١٣١ ف، لمعرفة أطرافه)[٣٢١].

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست پێی فەرمووم: ئەی عەبدوڵلا! بیستومە کە تۆ ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبیتو بەشەویش ناخەوی، هەر شەو نوێژ دەکەیت؟ گوتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا!. چۆن دەفەرمووی وایە، فەرمووی: وامەکە، ناو بەناو بەڕۆژوو بەو ناو بەناویش بەڕۆژوو مەبە، بەشەویش هەتا تاوێ شەو نوێژ بکەو، تاوێکیش بخەوە، چونکە لەڕاستی دا لەشەو جەستەت مافی هەیە لەسەر تۆ کە زۆر نەیڕەنجێنیو تارادەی پڕووکان نەیڕەتێنی وەهەروەها چاوەکانت مافیان هەیە لەسەر تۆ، وە هەروەها ژنەکەت مافی هەیە لەسەرتۆ، وەهەروەها میوانەکەت مافی هەیە لەسەر تۆ، جا دەبێ ئەمانە ڕەچاو بکەی، هەریەکەی بەپێی خۆی، وەلەگشت مانگێ تەنیا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە بەستە! چونکە چاکە یەك بەدەیە، ئیتر ئەوە وەك ئەوە وایە کە ساڵ دوانزە مانگەی خودا بەڕۆژوو بی.

عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەڵام من خۆم کارەکەم لەخۆم گران کردو باری خۆم قورس کرد، بۆیە لێم گرانو قورس کراوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا لەخۆم رادەبینمو بەخۆما رادەپەرمووم کە زیاتر بفەرموو، فەرمووی: کەواتە وەکوو پێغەمبەری خودا داوود بەڕۆژوو بە (دروودی خوای لەسەر بێ) وەلێی زیاد مەکە. عەرزیم کرد ڕۆژووی داود پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: ڕۆژ نا ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبوو، کەدەکاتە نیوەی ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگە. عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ پیر بوو بوو دەیفەرموو: خۆزگایەم کاتی خۆی روخسەتەکەی

---

[٣٢١] اخرجه مسلم في الصيام، باب: النهي عَنْ صوم الدهر لمت تضربه، رقم: ١١٥٩.

پێغەمبـەرم قـەبووڵ بکردایـە. (ریـاض/١ ژمـارە/١٥٠، تـاج/١/٤٩٤ ز/١٨١ ف/٩، بڕوانە: ژمارە/٥٦٤ کە لەپێشەوە لەبەرگی یەکەم دا رابووورد).

٩١٢- (مكرر) وَعَنْهُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) فِي رِوَايَةٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى قَالَ: مَنْ لِي بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ عَطَاءٌ لاَ أَدْرِي كَيْفَ ذَكَرَ صِيَامَ الأَبَدِ، قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ ». مَرَّتَيْنِ. (الحديث ١٩٧٧)[٣٢٢].

لەگێڕانەوەیەکی تری دا فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: لەسـەر شـێوەی بـەڕۆژوو بـوونی پێغەمبـەر داود (درووودی خـوای لەسەر بێ) بەڕۆژوو بە، دەسـتووری داود وابـوو رۆژ نـا رۆژێ بـەڕۆژوو دەبوو، کاتێکیش لەشەڕدا بەرەنگاری لەشکری دوژمن دەبوو لەبەری هەڵنەدەهات.

عەبـدوڵلا فـەرمووی: جاکـێ دەبـێ بەدەسـتەبەری ئـەوە بـۆ مـن ئـەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبـەر ردود فـەرمووی: رۆژووی ئـەو کەسـە گیرا نـەبێ کەساڵ دوانـزە مانگـە بـەڕۆژوو دەبـێ، دووجـار ئـەم نزایـەی دووبـارە کـردەوە. (ریاض/١ ژمارە:١٥٠ ز/١٤).

٩١٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أُمِّ سُلَيْمٍ، فَأَتَتْهُ بِتَمْرٍ وَسَمْنٍ، قَالَ « أَعِيدُوا سَمْنَكُمْ فِي سِقَائِهِ، وَتَمْرَكُمْ فِي وِعَائِهِ، فَإِنِّي صَائِمٌ ». ثُمَّ قَامَ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَصَلَّى غَيْرَ الْمَكْتُوبَةِ، فَدَعَا لأُمِّ سُلَيْمٍ، وَأَهْلِ بَيْتِهَا، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي خُوَيْصَةً، قَالَ « مَا هِيَ ». قَالَتْ خَادِمُكَ أَنَسٌ. فَمَا تَرَكَ خَيْرَ آخِرَةٍ وَلاَ دُنْيَا إِلاَّ دَعَا لِي بِهِ قَالَ « اللَّهُمَّ ارْزُقْهُ مَالاً وَوَلَدًا وَبَارِكْ لَهُ ». فَإِنِّي لَمِنْ أَكْثَرِ الأَنْصَارِ مَالاً. وَحَدَّثَتْنِي ابْنَتِي أُمَيْنَةُ أَنَّهُ دُفِنَ لِصُلْبِي مَقْدَمَ حَجَّاجٍ الْبَصْرَةَ بِضْعٌ وَعِشْرُونَ وَمِائَةٌ. (الحديث ١٩٨٢، أطرافه ٦٣٣٤، ٦٣٤٤، ٦٣٧٨، ٦٣٨٠)[٣٢٤].

---

[٣٢٢] اخرجه مسلم في الصيام، باب: النهي عَنْ صوم الدهر لمن تضرر به... رقم: ١١٥٩.

[٣٢٤] قال العلامة العيني: هذا الحديث من افراد البخاري وكذلك استثناء العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم من الأحاديث التي وافقه عليها مسلم. (المترجم).

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدێنی چوو بۆ ماڵی ئومم‌و سولەیمی دایکی، کەئەو کاتە ژنی ئەبو طەلحە بوو، وەمن نەوجەوان بووم، ئومم‌و حەرامی خوشکی دایکیشم لەوێ بوو، دایکم خورماو ڕۆنی دانا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە نۆشی بکا، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆنەکەتان بکەنەوە هیزەکەی‌و خورماکەتان بکەنەوە دەفرەکەی، چونکە من بەڕۆژووم نان‌و ئاو ناخۆم، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵسا، لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کرد، ئێمەیش پەیڕەومان پێکرد، وەلەگەڵیدا ئەو نوێژەمان بەکۆمەڵی کرد.

جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) نزای باشی بۆ ئومم‌و سولەیم‌و کەس‌و کارەکەی کرد. ئەمووو سولەیم عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا داوایەکی تایبەتی بچکۆلەم هەیە لەخزمەتتدا؟ فەرمووی: چییە؟ عەرزیکرد: داوام ئەوەیە کە نزایەکی خێر بۆ ئەنەسی نۆکەرت بکەی ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی خێری هەردوو جیهان بێ، نزای ئەوەی کرد بۆ من، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی پەروەردگارم! ئەی یەزدانی پاك! ماڵی ڕەحمەت‌و منالی ڕەحمەتی پێ خەڵات بفەرموو، وەپیت‌و فەڕ بخەرە سەرو ماڵی.

ئەوەتا دەبینن لەپیت‌و بەرەکەتی نزاکەی پێغەمبەرەوە یەکێکم لەو ئەنصارانەی کە خودا دارایی‌و سامانێکی زۆر زۆری پێ بەخشیون، بۆ مەسەلەی منالێش ئومەینە کە کچی گەورەمە قسەی بۆ کردووم، کە هەتا ئەو ساڵەی کە حەجاج هات بوو بەسەرۆکی بەصرە، کە ساڵی حەفتاو پێنجی کۆچی بووە، کە ئەوکاتە تەمەنم لەهەشتا بەرەو ژوور بوو، زیاتر لەسەدو بیست منالم مردوون، کە گشتیان یەك سەر لەپشتی خۆم بوون، چ جای کوڕەزاو کچەزا!.

**راڤەو شیكردنەوە:**

ئەو بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١- باوك گێڕانەوە لەكچی خۆیەوە ئەنجام دەدا، وەك ئەنەس لە نامینەوە.

٢- هەموو كاتێ وا سوننەتە لەپێش نزاو پاڕانەوەو داوای مەبەست دوو ركات نیوێژی سوننەت بكرێ.

٣- هەندێ نوێژی سوننەت بەجەماعەت دەكرێ.

٤- نوێژی ماڵەوە لەشوێنێكی بەلاوە بكرێ باشترە.

٥- رووداوی گەورە بكرێ بەسەرەتای مێژوو.

٦- ئەنەس نزیكەی سەد ساڵ ژیاوە.

٧- ئەو كاتەی ئیمامی ئەنەس ئەم فەرموودەیەی باس كردووە بۆ ثابیتی فەوقێی، یا بۆ حومەیدی فەقێی، زیاتر لەسەد مناڵو مناڵەزای تری بووە، كەهەموویان لەژیانا بوون!.

٨- بڕوانە: ژمارە/١٣ بەرگی/١ + تاج/٥ ل/١٨٤ ف/١ هەتا ٧).

٩١٤- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ). أَنَّهُ سَأَلَهُ – أَوْ سَأَلَ رَجُلاً وَعِمْرَانُ يَسْمَعُ – فَقَالَ « يَا أَبَا فُلاَنٍ أَمَا صُمْتَ سَرَرَ هَذَا الشَّهْرِ ». قَالَ أَظُنُّهُ قَالَ يَعْنِي رَمَضَانَ. قَالَ الرَّجُلُ لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ « فَإِذَا أَفْطَرْتَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ ». لَمْ يَقُلِ الصَّلْتُ أَظُنُّهُ يَعْنِي رَمَضَانَ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ وَقَالَ ثَابِتٌ عَنْ مُطَرِّفٍ عَنْ عِمْرَانَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « مِنْ سَرَرِ شَعْبَانَ ». (الحديث ١٩٨٣)[٣٢٤].

عیمرانی كوڕی حوصەین (ڕەزای خودا لەخۆیو باوكی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوێم لێی بوو لەپیاوێكی پرسی: ئەی باوكی فیسارە كەس! لە ناوەڕاستی ئەم مانگەدا، كە مانگی كوڵە مانگە، هیچ

[٣٢٤] اخرجه مسلم في الصيام، باب: إستحباب صيام ثلاث ايام من كل شهر، رقم: ١١٦١.

بەڕۆژوو بووی؟ پیاوەکە گوتی: نەء، فەرمووی: دەی لەجیاتی ئەوە کەڕەمەزان تەواو بوو دوو رۆژ بەڕۆژوو بە.

لەگێڕانەوەیەکی تردا لەعیمرانەوە: فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): لەکۆتایی مانگی کوڵەمانگەوە هیچ بەڕۆژوو بووی.... تاد. (تاج/٢/١٣٠ ز/٦٢ – ش).

## راڤەو شیکردنەوە:

له (غاية المأمول شرحي تاج الأصول)دا ئاوا راڤەی (سەرەر)دەکا: (السر بالتثليت جمع سرة وهي الوسط أي الأيام البيض): سەرەرکۆی سەررەیە، بریتییە لەناوەڕاستی مانگ، کەدەکاتە رۆژە شەو رووناکەکان، کە بریتین لە ١٣، ١٤، ١٥ی مانگ، کەچی لە صەحیحی بوخاری دا ئەم فەرموودەیە لەسەرباسی رۆژوو لەکۆتایی مانگ دەردەهێنێ وە مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: جەماوەری زانایان دەفەرموون: مەبەست بە سەرەر لەم جێگەیەدا، کۆتایی مانگە، بریتییە لەشەوی (٢٨، ٢٩، ٣٠) چونکە مانگ لەم شەوانەدا پەنا دەگرێو پەنهان دەبێ، سەرە لە (سر)ە بەواتا: پەنهانو خۆشاردنەوە... تاد. مەبەست ئەوەیە: کە (سەرە) هەردوو واتاکە هەڵدەگرێ بۆیە منیش هەردوو واتاکەم رەچاو کرد.

٩١٥– عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ أَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَقَالَ نَعَمْ. (الحديث ٢٧٣٧)[٣٢٥].

موحەممەدی کوڕی عەباد (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە جابیرەم پرسی (ڕەزای خوای لێ بێ) ئایا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر

---

[٣٢٥] اخرجه مسلم في الصيام، باب: كراهة صيام يوم الجمعة منفرداً، رقم: ١١٤٣.

بێ) نەهی دەکرد لەگرتنی ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنها؟ فەرمووی: بەڵێ، مەگەر لەپێشەوە، یا لەپاشیەوە ڕۆژووی تری لەگەڵ دا بگرێ. (تاج/٢/١٢١ ز/٥٦).

٩١٦- عَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ - رضى الله عنها - أَنَّ النَّبِىَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهْىَ صَائِمَةٌ فَقَالَ « أَصُمْتِ أَمْسِ ». قَالَتْ لاَ. قَالَ « تُرِيدِينَ أَنْ تَصُومِى غَدًا ». قَالَتْ لاَ. قَالَ « فَأَفْطِرِى ». (الحديث ١٩٨٦)[٣٢٦].

جوویریيەی کچی حاریث کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (ڕەزای خودا لە هەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: ڕۆژی هەینی بوو بەڕۆژوو بووم، ڕۆژووی سوننەت، پێغەمبەر هات بۆلام، فەرمووی: دوێنێ بەڕۆژوو بووی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: باشە دەتەوێ لەگەڵ ئەمڕۆدا سبەی بەڕۆژوو بی؟ گوتم: نەء، فەرمووی: کەوایە ڕۆژووەکەت بشکێنە.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

١- لەفیقهی ئاسانا، لەزنجیرەی:١٤٧ ل/٣٣٧ بەرگی/١ لەسەر باسی (ڕۆژووی ناباش-الصوم المكروه)دا دەفەرموێ: دوو ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگە ناباشە، حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەروێ: ڕۆژووی ئەو کەسە گیرا نەبێ کە ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبێ!. ڕۆژووی ڕۆژی هەینیش بەتەنیا ناباشە، ئەگەر بەنیازی ڕۆژووی سوننەت بێ. هەروەها ڕۆژووی شەممەیش بەتەنیا خۆی ناباشە، هەروەها گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی یەك شەممەیش ناباشە.

٢- جوویریيەی کچی حاریث، هاوسەری پێغەمبەر یەکێکە لەدایکانی باوەڕداران، لەهۆزی بەنی موصطلیق، لەپێشدا ناوی (بەررە)بوو، کە پێغەمبەر

[٣٢٦] قال العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جوريرة في صوم يوم الجمعة. (المترجم).

مارەی کرد ناوەکەی گۆڕی‌و ناوی نا (جووەیرییە)، حاریثی باوکی ئاغای هۆزی بەنی موصطلیق بوو. کۆمەڵێ فەرموودەی پێغەمبەرەوە لەبەر کردووە، لەبوخاری‌و موسلیم دا لەچەند شوێن‌و بۆنەیەکدا ناوی هاتووە، تەنیا ئەم فەرموودەیەی نێرەی هەیە لەبوخاری دا کە خۆی گێڕابێتییەوە لەپێغەمبەرەوە، لەسەر فەرمایشتی شێخی عەینی، ئافرەتێکی یادکاری زمانپاراو بەیادی خوا بوو، جاری وا دەبوو کە نوێژی بەیانی دەکرد لەسەر جێگە نوێژەکەی دادنیشت، کۆمەڵێ ناوکەخورما یا بەردە وردەی لەبەردەمی خۆی دا دادەنا، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ، لەباتی تەزبیح ویردو تەسبیحاتی دەژمارد ساڵی (٥٦)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ) بۆ زانیاری زیاتر فەرموو بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

(تاج/١/٣٢٠ ز/١٠٨ ف/٧ + تاج/٢ ل/٣١٠ ز/١٤٩ + تاج/٣/٣٨ ز/١٨ + تاج/٥/ ز/٣٥ + تاج/٨/٢٢٦ ز/٩٢ + تاج/٩/١٦٤ ف/٣، ٤ + عەینی/١١ ل/١٠٦ + فتح الباری/٤ ل/٢٣٢، فەرموودەی ز/١٩٨٤ + الإصابة في تمييز الصحابة/٤ ل/٢٥٦ ز/٢٥١ + الإستيعاب في معرفة الأصحاب/٤ ل/٢٥٨ جويرية + تاج/١ ل/٢١٧ + تاج/٢ ل/٢٠٢ + تاج/٢ ل/٢٧٢ + تاج/٥ ل/١٠١ + صەحیحی مسلم/١٧ ل/٤٤ + صەحیحی مسلم/١٠/١٤٠-١٤٥ + عینی/١١/٢٨٧ + عینی/١٧ ل/٣٠٤ + عینی/١٧/ ل/٣١٤ + عینی/١٣/٩٥).

٩١٧- أنَّ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنها) سُئِلَتْ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَختَصُّ مِنَ الأَيَّامِ شَيْئًا قَالَتْ لاَ، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يُطِيقُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُطِيقُ؟. (الحديث ١٩٨٧، طرفه ٦٤٦٦)[٣٢٧].

---

[٣٢٧] عده العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم من الأحاديث التي وافقه مسلم على تخريجها فتح /٤ ص/٢٤٩ (المترجم).

ئیبراهیمی کوڕی عەلقەمە فەرمووی: عەرزی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم کرد: ئایا پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) لە هەندێ رۆژدا زیاتر پەرستشی ئەنجام دەدا؟ فەرمووی: نەخێر، کاری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) هەمیشەیی بوو، کە خووی دەگرت بە کردنی شتێکی سوننەتەوە، وەك سیواكو شەونوێژ دەیکرد بەپیشەی هەمیشەیی، عائیشە فەرمووشی: ئەو بەردەوام بوونە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەیبوو لەسەر تاعەتو ویردو زیکر، کەسی تر ئەوەی لەتوانادا نییە.

٩١٨عن عائِشَةَ وابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُم) قَالاَ لَمْ يُرَخَّصْ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ أَنْ يُصَمْنَ، إِلاَّ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الْهَدْيَ. (الحديث ١٩٩٨)[٣٢٨].

عائیشەو ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان مۆڵەت نەدراوە بەکەس کەسێ رۆژەی پاش یەکەم رۆژی جەژنی قوربان بەڕۆژوو بێ، کە ناوداران بە (أيام تشريق) مەگەر بۆ کەسێ کەلە حەجا تەمەتتوعی کردبێو توانای هەدی نەبێ، ئەوە بۆی هەیە لەباتی کەفارەت ئەو سێ رۆژە بەڕۆژوو بێ. (تاج/٢/١١٩ ز/٥٣).

٩١٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنها) قَالَتْ كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ تَرَكَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ. (الحديث ٢٠٠٢). بەکوردی کردنەکەی لە ژمارە/٧٦٤ دا ڕابورد[٣٢٩].

---

[٣٢٨] قال العسقلاني في خاتمة كتاب الصوم: لم يوافقه مسلم على تخريج حديث إبن عمر في صيام ايام التشريق. (المترجم).

[٣٢٩] من أطراف الرقم: ٧٦٤. (المترجم).

٩٢٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ، فَرَأَى الْيَهُودَ تَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ « مَا هَذَا ». قَالُوا هَذَا يَوْمٌ صَالِحٌ، هَذَا يَوْمٌ نَجَّى اللَّهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ، فَصَامَهُ مُوسَى. قَالَ « فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ ». فَصَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ. (الحديث ٢٠٠٤، أطرافه ٣٣٩٧، ٣٩٤٣، ٤٦٨٠، ٤٧٣٧)[٣٣٠].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەهات بۆ مەدینە تەماشای کرد جوولەکەکان ڕۆژی دەی موحەڕەم بەڕۆژوو دەبن، فەرمووی: ئەم ڕۆژە چییە؟ گوتیان: ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر پیرۆزو باشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خودا ئەوەی حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەری تیادا رزگار کردووە لەدەستی دوژمنی خۆیان، وە مووسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم ڕۆژەدا سوپاس بۆ خودا لەسەر نازو نیعمەتی رزگاربوون لەدەستی دوژمن، بەڕۆژوو بووە، وە ئێمەیش چاو لەودەکەین‌و ئەم ڕۆژە بەڕۆژوو دەبین، حەزرەتیش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: کەوابێ بۆمن ڕەواترە کەلەمەدا پەیڕەوی مووسا بکەم هەتا ئێوە، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هەم خۆی گرتی‌و هەم فەرمانی کرد بە موسوڵمانان کەئەم ڕۆژە بەڕۆژوو بن. (تاج/٢/١٢٥ ف/٢ ز/٦٠).

## پایانێ (خاتمة)

پێشەوا عەسقەلانی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەفەتحولباری دا لەکۆتایی ئەم نامەی ڕۆژوومدا، دەفەرموێ: نامەی ڕۆژوو لەسەرەتاکەیەوە هەتا ئێرە، (١٥٧) فەرموودەی لەخۆ گرتووە، بێڕشتە (معلق)ەکانیان (٣٦) فەرموودەن، (١٢١)ەکەی تریان گشتیان پەیوەست (موصول)ن، ئەوانەی کەلەم نامەی

[٣٣٠] اخرجه مسلم في الصيام، باب: صوم يوم عاشوراء، رقم: ١١٣٠.

رۆژووەدا یا لەپێشەوە، دووبارە بوونەتەوە (٦٨) فەرمووده‌ن، پوختەکەیان (١٥٧-٦٨=٨٩) فەرموودەیە، پێشەوا موسلیمیش (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) هەموویانی دەرهێناوە، بێجگە لەمانەیان:

١- ژمارە: (٨٧٦ ت + ١٩٠٣ ف).

٢- ئەثەرە موعەللەقەی عەمماری کوڕی یاسیر، کەنەیی لە ڕۆژووی ڕۆژووە گومان (یوم الشك)دەکا، یەکسەر وا لەپێش ژمارە:١٩٠٦ فەتح، لە تەجریدەکەدا نییە.

٣- ژمارە: ١٩١١ ف. لە تەجریدەکەدا نییە. گەرچی ناوەرۆکەکەی لە فەرموودەی ژمارە: ٨٨٠ ت = ١٩١٠ فتح دا هەیە.

٤- بێڕشتە (تەعلیق)ێکە، لەئەبو هورەیرەوە، وادەگەیەنێ کە بشکێنی، ئەم پێڕشتەیە وا لەکۆتایی فەرموودەی ژمارە:٨٨٩ ت=١٣٢٥، ١٩٢٦ ف دا، لەتەجریدەکە دا نییە چونکە بەپێی مەرجی دانەرەکەی نییە، چونکە دانەری تەجرید بەس مەوصولی مەرفوعو ئەوەی لەحوکمی مەوصولی مەرفوع دابێ، دەری دەهێنێ.

٥- بێڕشتەیەکە، لەبابەت سیواك کردنەوە بۆ ڕۆژووەوان، لە عامیری کوڕی ڕەبیعەوە وا لەپێش ژمارە:١٩٣٤ف وە، لەتەجریدەکەدا نییە.

٦- بێڕشتەکەی ئەبو هورەیرە (لولا أن أشق أمتي لأمرتهم بالسواك) وا لەپێش ژمارە:١٩٣٤ ف. وەلەتەجریدەکەدا نییە، لەلای موسلیم ئەم فەرموودەیە بەجۆرێ ترە.

٧- بێڕشتەکەی عایشە لەبابەت سیواکەوە، وا لەپاش بێڕشتەکەی ئەبو هورەیرەوە، کەوا لەپاش (١٩٣٤ف)ەوە.

٨- بێڕشتەکەی جابیر کەوا لەنێوانی ئەم دوانەدا.

٩- بێڕشتەکەی زەیدی کوڕی خالید، کەوا لەگەڵ ئەمانەدا.

١٠- بێڕشتەکەی ئەبوهورەیرە: (من افطر یوماً من رمضان من غیر علة..) لەتەجریدەکە دا نییە، وا لەپێش (١٩٣٥)ەوە.

١١- بێڕشتەکەی حەسەنی بەصری: (أفطر الحاجم والمحجوم): والەپێش (١٩٣٨ف)ەوە.

عەسقەلانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لێرەدا دەفەرموێ: ئەم فەرموودانەی کەباسمان کردن، هەموویان بێڕشتەن بێجگە لەیەکەمیان، کە ژمارە: (٨٧٦ ت = ٢١٩٠٣ف)ە، بەلاّم وەك دەردەکەوێ سێیەمیشیان کە ژمارە: (١٩١١ف)ە، موصووله، بێڕشته نییه، ڕەنگ بێ هەڵەی چاپ بێ، خۆی ئاوابێ: بێجگە لەیەکەمو دووەمیان.

١٢- فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس: (إحتجم وهو صائم = ٨٩٣ ت = ١٩٣٨ ف).

١٣- ژمارە: ١٩٤٠ ف. لەتەجریدەکەدا نییە، لەبابەت ناباشی کەڵەشاخگرتنەوە.

١٤- بێڕشتەکەی ئیبنو عومەر، سەبارەت بەنەصی ئایەتی {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ} (سورە البقرە - ١٨٤)، والەپێش (١٩٤٩ف)ەوە. لەتەجریدەکەدا نییە.

١٥- بێڕشتەکەی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، کەوا لەگەڵ بێڕشتەکەی ئیبنو عومەردا.

١٦- بێڕشتەکەی ئیبنو ئەبی یەعلا، کەوا لەپێش ژمارە: (١٩٤٩ف)ەوە.

١٧- مورسەلەکەی ئەبو هورەیرە لە بابەت (تفریط)ەوە والەپێش ژمارە (١٩٥٠)فەتحەوە.

١٨- فەرموودەی: (ونهى النبي (صلى الله عليه وسلم) عن أي الوصال رحمة لهم وإبقاء عليهم)، والةئێش (١٩٦١ف)ةوة.

١٩- ژمارە: (٩٠٦ت = ١٩٦٣ف).

٢٠- ژمارە: (٩٠٨ت = ١٩٦٨ف).

٢١- ژمارە: (٩١٣ ت = ١٩٨٢ ف).

٢٢- ژمارە: (٩١٦ ت = ١٩٨٦ف).

٢٣- فەرموودەکەی ئیبنو عومەر سەبارەت بە گرتنی رۆژووی رۆژی جەژن (١٩٩٤) لەتەجریدەکەدا نییە.

٢٤- (٩١٨ ت = ١٩٩٨ ف).

٢٥- (٩١٨ ت = ١٩٩٧ف).

هەروەها مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: لەم نامەی رۆژووەدا، (٦٠) بیستراو (ئەثەری صەحابەو تابیعینی وا تیادا، زۆربەیان بێرشتەن، کەمێکیان نەبێ کە پەیوەستن).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٣٧- نامەی نوێژی تەراویح (كتاب صلاة التراويح)

٩٢١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاَتِهِ فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ فَصَلَّوْا مَعَهُ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا فَكَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضَى الْفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ « أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ مَكَانُكُمْ، لَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا ». فتوفي رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) والأمرُ على ذلك. (الحديث ٢٠١٢)[٣٣١].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: شەوێ لەشەوەکانی ڕەمەزان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناوجەرگەی شەودا دەرچوو لەماڵو چوو بۆ مزگەوتو لەوێ دەستی کرد بەشەو نوێژ، وە چەند پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر لەپشتیەوە پەیڕەوی (ئیقتیدا)یان پێ کردوو، دەستیان کرد بە

---

[٣٣١] اخرجه مسلم في الصيام، باب: الترغيب في صلاة التراويح (صم/٦/٤١، ٤٢). (المترجم).

نوێـژكردن بەجەماعـەت لەگـەڵیاو جاكاتـێ ڕۆژ بـۆوە، خـەڵك ئـەم باسـەیان گێڕایـەوە بـۆ یـەكتری، وەلەشـەوی دووەمـا خـەڵك زۆرپـتر گـردەوە بـوونو پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسـەر بێ) دیسان بەرنوێـژی بـۆ كردنـەوە، وە سبەینێ ئـەم باسە تـەواو بڵاو بـوو، جا بـۆ شـەوی سـێیەم خـەڵكێكی زۆر لـە مزگـەوت كـۆوە بـوونو دیـسانەوە شـەو نوێـژیان بەجەماعـەت لەپـشت پێغەمبـەرەوە كـردەوە، جا لەشـەوی چوارەما هاوڕێیـانی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بـێ) ئەوەنـدە زۆر كۆبوونـەوە مزگـەوت نەیـدەگرتن، بـەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم شەوەدا، نـەهات بۆناویـان بـۆ شـەو نوێـژ، جـا سـبەینێ كـە هـات بۆناویـانو نوێـژی سـبەینێی بـۆ كـردن، ڕووی تێكـردنو شـایەتمانی هێنـاو فـەرمووی (دروودی خـوای لەسـەر بـێ): لـەپاش سوپاسو ستایشی خودای گـەورە، مـن ئەمـشەو ئاگاداربووم لـەهاتنی ئێوە بـۆ مزگەوتو ئاگام لەحاڵتان بوو، بەڵام كە نەهاتم بۆلاتان لەبەر ئەوە بوو مەبادا ئەم تەراویحە فەرز بكرێ لەسەرتان، وە ئێوەیش بۆتان نەكرێ.

زوهری فەرمووی: (ئیتر هەتا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) كۆچی دوایی كرد، شـەونوێژی ڕەمـەزان هـەر لەسـەر ئـەم شێوەیە بـوو). (تـاج/٢/٩٦-ش).

## باسی گەورەییو پیرۆزی شەوی لەیلەتولقەدر

٩٢٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رِجَالاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ ». (الحديث ٢٠١٥)[٣٣٢].

---

[٣٣٢] اخرجه مسلم في الصيام، باب: فصل ليلة القدر والحث على طلبها، رقم: ١١٦٥.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: چەند پیاوێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لە خەونا پێیان گوترا بوو کەشەوی لەیلەتولقەدر دەکەوێتە حەوت شەوەکانی دوایی ڕەمەزانەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کاتێ ئەم خەونەی پێ گەیشتەوە فەرمووی: وادەزانم خەونەکەتان پێکاویەتیو ڕێك دەکەوێت لەگەڵ ڕاستی دا، جا کەوابێ ئەو کەسەی کەدەیەوێ مشووری ئەم شەوە بخوات، با لەحەوت شەوەکانی دوایی ڕەمەزان دا مشوری بۆ بخوات. (تاج/۲/۱۷٦ — س/د/ن + ریاض/۳/۸۹۱ ف/۲).

٩٢٣- عن أَبِي سَعِيدٍ الخُدري (رضي الله عنه) اعْتَكَفْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعَشْرَ الأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، فَخَرَجَ صَبِيحَةَ عِشْرِينَ، فَخَطَبَنَا وَقَالَ « إِنِّي أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، ثُمَّ أُنْسِيتُهَا أَوْ نُسِّيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ فِي الْوَتْرِ، وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنِّي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ، فَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلْيَرْجِعْ ». فَرَجَعْنَا وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَةً، فَجَاءَتْ سَحَابَةٌ فَمَطَرَتْ حَتَّى سَالَ سَقْفُ الْمَسْجِدِ وَكَانَ مِنْ جَرِيدِ النَّخْلِ، وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْجُدُ فِي الْمَاءِ وَالطِّينِ، حَتَّى رَأَيْتُ أَثَرَ الطِّينِ فِي جَبْهَتِهِ. (الحديث ٢٠١٦)[٣٢٣].

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەدەشەوی یەکەمی ڕەمەزان دا لەمزگەوت خەڵوەی دەکێشا، واتە ئیعتیکافی کرد لەپاشا لەدەشەوی ناوەڕاستیشا خەڵوەی کێشا، لەناو چاتۆڵێکی لباد دا بوو، حەسیرێ پەردەی دەرگاکەی بوو، گوتی: جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی حەسیرەکەی هەڵگرتو لەگۆشەیەکی چاتۆڵەکەوە دووری خستەوە، ئینجا بەیانی ڕۆژی بیستەمی

---

[٣٢٣] انظر (صم ٨/ ٦٠ - صحيح مسلم بشرح النووي، ج/٨ ص/ ٦٠ وما بعدها + رقم: ٤٦). (المترجم)

ڕەمەزان لەدەرگای چاتۆڵەکەوە سەری کێشاو وتارێکی بۆمان دا وەقسەی لەگەڵ خەڵکەکە کرد، ئەوانیش لێی نزیك بوونەوە، فەرمووی: من پێم گوترا بوو کەشەوی لەیلەتولقەدر کام شەوەیە لەمانگی ڕەمەزانا، بەڵام دوایی لەبیرم برایەوە، مـن لـەدەی یەکـەما خـەڵوەم کێشا منـەیی شـەوی لەیلەتولقـەدرم دەکـردو، بـۆ ئـەو شـەوە دەگـەڕام هـەروەها لـەدەی ناوەڕاسـتیش دا کەچـی جوبرائیـل هاتـە لام فـەرمووی: کەئـەو شـەوە لـەدەی دوایـی دایـە، کەواتـە: هەرکەستان حەزدەکەن کەئـەم دەشـەوەی دواییـەیش خـەڵوە بکێـشن، ئـەوا بـۆ شـەوی لەیلەتولقـەدر بگـەڕێن، ئـیتر مەردوومەکـەش لەگـەڵ پێغەمبـەر دا (درووودی خوای لەسەر بێ) ئـەو دەشـەوەی تـریش خـەڵوەیان کێشایەوە لـەناو مزگـەوتا، فـەرمووی (درووودی خـوای لەسـەر بـێ)و لەخـەوما نیـشانم درا کەشـەوی بـەڕێز (لەیلەتولقـەدر) شـەوێکی تـاك دەبـێ، وە لەبـەیانی یەکەیـدا کوڕنووش لەناو قوڕاوو باراناودا دەبەم بۆ خوا، جا وا ڕێکەوت شەوی بیستو یەك باران باری، مزگەوتەکە دڵۆپـەی کـرد، بەچاوی خـۆم ئـاوو قوڕەکەم دی، پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەر بـێ) کەلەنوێـژی بـەیانی بـووەوە چـووە دەرەوەو تـەوێڵو سـەری لـووتی ئـاوو قوڕیـان پێـوە بـوو، وە خەونەکـەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) هاتە دی، جا تەماشامان کرد ئـەو شـەوە شەوی بیستو یەك بوو، لەدەشەوی دوایی ڕەمەزان. (تاج/٢/١١٨ – ش/د/ن).

٩٢٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ « الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي تَاسِـعَةٍ تَبْقَـى، فِـي سَـابِعَةٍ تَبْقَى، فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى ». (الحديث ٢٠٢١، طرفه ٢٠٢٢)[٣٣٤].

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودو صەلاواتو سەلامو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەر بێ)

---

[٣٣٤] قـال العسقلاني لم يوافقـه علـى تخريجـه (فـتح/٤ مـسلم/٢٨٦ – خاتمـة كتـاب الإعتكاف). (المترجم).

فەرمووی: (لەشەوەکانی دەی دوایی ڕەمەزان دا بۆ شەوی لەیلەتولقەدر بگەڕێن، بەتایبەتی لەشەوی (٢١، ٢٣، ٢٥)دا. (تاج/٢/١١٦ ز/٥١ ف/٥ — ش/د).

٩٢٥– وَعَنْهُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) في روايةٍ: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) « هِيَ فِي الْعَشْرِ، هِيَ فِي تِسْعٍ يَمْضِينَ أَوْ فِي سَبْعٍ يَبْقَيْنَ ». يَعْنِي لَيْلَةَ الْقَدْرِ. (الحديث ٢٠٢٢)[٣٣٥].

دیسان ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خۆی لەدەی دوایی ڕەمەزان دایە، یا شەوی بیست و نۆیە یا شەوی بیست و حەوت. واتە: لەیلەتولقەدر.

٩٢٦– عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – قَالَتْ كَانَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ. (الحديث ٢٠٢٤)[٣٣٦].

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وابوو، کە دەی دوایی ڕەمەزان دەهات خۆی گورج دەکردەوە بۆ خوا پەرستی و بەشەو نوێژو یادی خودا شەوی خۆی ئاوەدان دەکردەوە، وەکەسوکاری خۆشی خەبەر دەکردەوە بۆ هەمان مەبەست. (ریاض/١/١٠٧ ز/١١ ف/٩٩ + تاج/٢/١١٥ ف/١ ز/٥١ — ش/د/ت/ن، فیقهی ئاسان/١/١٧٠-١٧٨).

---

[٣٣٥] راجع رقم/٩٢٤ (المترجم).

[٣٣٦] اخرجه مسلم في الإعتكاف، باب: الإجتهاد الأواخر من رمضان، رقم: ١١٧٤.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٣٨- نامەی خەڵوەكێشان (كتاب الإعتكاف)

بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی/١ ل/٣٤٧ ز/١٥٦).

### ١- باسی: خەڵوەكێشان لەدەی كۆتایی ڕەمەزان دا وە باسی دروستی خەڵوەكێشان لەهەموو مزگەوتێك دا

٩٢٧- عَنْ عَائِشَةَ - رضى الله عنها - زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ. (الحديث ٢٠٢٦)(٣٣٧).

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) وە ڕەزای خودا لەهاوسەرە پاكیزەكانی بێ فەرمووی: جاران پێغەمبەر كردبووی بە دەستوور، لەدەی دوایی ڕەمەزاندا، لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەكێشا، بۆیە لەپاش خۆشی ژنەكانیشی لەمزگەوتا خەڵوە دەكێشن!. (ریاض/٩٣١/٣ ز/٢٣٢ ف/٢).

٩٢٨- وَعَنْهُمَا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَتْ وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةٍ، إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا. (الحديث ٢٠٢٩، أطرافه ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥)(٣٣٨).

دیسان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) كەلەناو مزگەوتا خەڵوەی دەكێشا، لەدەرگای هۆدەكەی خۆمەوە كەلەسەرماڵی مزگەوت بوو سەری دەهێنا، سەریم شانە دەكرد ئەو لەناو مزگەوتا بوو، من لەناو هۆدەكەی خۆم دا بووم، لەسەر ئەو حاڵە قژە سەریم شانە دەكرد، وە بۆ سەراویش نەبوایە نەدەهاتەوە بۆ

(٣٣٧) اخرجه مسلم في الصيام، باب: إعتكاف العشر الأواخر رقم: ١١٧٢.

(٣٣٨) اخرجه مسلم في الحيض، باب: جواز غسل الحائض راس زوجها، رقم: ٢٩٧.




ماڵەوە. (تاج/٢/١٤٦ ز/٧٥ ف/١ — ش/د/ت/ن = شەيخان، ئەبو داود، ترميزی، نەسائی).

٩٢٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) أَنَّ عُمَرَ سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، قَالَ « فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ ». (الحديث ٢٠٣٢، أطرافه ٢٠٤٣، ٣١٤٤، ٤٣٢٠، ٦٦٩٧)[٣٣٩].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیاری کرد لەپێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لەسەردەمی نەزانی دا لەپێش هاتنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا نەزرم کردووە کەشەوێ لەناو مەسجیدولحەرام دا خەڵوەبکێشم جا دەفەرمووی چی؟ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: نەزرەکەت بەجێ بهێنە. ئیتر ئەویش شەوێ لەناو مەسجیدولحەراما خەڵوەکەی کێشا.

٩٣٠- عَنْ عَائِشَةَ – رضى الله عنها – أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ إِذَا أَخْبِيَةٌ خِبَاءُ عَائِشَةَ، وَخِبَاءُ حَفْصَةَ، وَخِبَاءُ زَيْنَبَ، فَقَالَ « آلْبِرَّ تَقُولُونَ بِهِنَّ ». ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ، حَتَّى اعْتَكَفَ عَشْرًا مِنْ شَوَّالٍ. (الحديث ٢٠٣٤)[٣٤٠].

لەتاجول ئوصولا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کە دەیویست خەڵوە بکێشێ لەمزگەوتا نوێژی بەیانی دەکردو دەچووە ناو خەڵوەخانەکەیەوە، جارێکیان لەدەی دوایی ڕەمەزان دا

---

[٣٣٩] اخرجه مسلم في الإيمان والنذور، (عيني ١٤٦/١١). (المترجم).

[٣٤٠] اخرجه مسلم في الإعتكاف باب: متى يدخل من اراد الإعتكاف في معتكفه، رقم: ١١٧٣.

ويستی خەڵوەبكێشێ، جا فەرمانی كرد چاتۆڵەكەیان لەناو مزگەوتا بۆ هەڵدا زەینەبیش گالی دا، چاتۆڵەكەی خۆیان بۆهەڵدا ژنەكانی تریشی وەك عائیشەو حەفصە هەروا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە نوێژی بەیانی كرد، چاتۆڵەكانی دی، ناو مزگەوتەكەیان داگیر كردبوو، جا فەرمووی: ئایا مەبەستیان كردنی كردەوەی چاكەیە، یا بۆ چاو لێ كەرییەو هیچی تر؟ ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی كرد چاتۆڵەكەی ئەویان خست، وەلەو ڕەمەزانەدا خەڵوەی نەكێشا، وەلەدەی یەكەمی شەشەلانا خەڵوەی كێشا. (تاج/٢/١٤٥ ز/٧٤ ف/٣ — ش/د/ن).

٩٣١- عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ، فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَعَهَا يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ مَرَّ رَجُلاَنِ مِنَ الأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « عَلَى رِسْلِكُمَا إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ». فَقَالاَ سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) « إِنَّ الشَّيْطَانَ يَبْلُغُ مِنَ الإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا ». (الحديث ٢٠٣٥، أطرافه ٢٠٣٨، ٢٠٣٩، ٣١٠١، ٣٢٨١، ٦٢١٩، ٧١٧١)[٣٤١].

صەفییەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاكیزەكانی بێ فەرمووی: جارێ پێغەمبەر لەدەی دوایی ڕەمەزان دا لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەكێشا شەوێ چووم بۆ سەردانی، تاوێ لەخزمەتی دا مامەوەو قسەو گوفتوگۆم لەگەڵ كردو هەڵسام بچمەوە بۆ

---

(٣٤١) اخرجه مسلم في السلام، باب: بيان انه يستحب لمن رؤى خالياً بامراة، رقم: ٢١٧٥.

ماڵەوە پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵما هات تا ڕەوانەم بکات وەماڵی صەفییە لەو خانووەدا بوو، کەلەوە دوا بوو بەهی ئوسامەی کوڕی زەید، صەفیە فەرمووی: ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەو دەرگایەی مزگەوت کەوا لەلای دەرگای ماڵی ئوممو سەلەمەدا، جا لەو کاتەدا دوو پیاو لەیاریدەدەران (ئەنصار) لەوێوە ڕەت بوون کاتێ کە پێغەمبەریان دی لەگەڵ من دا بوو سڵاویان لێ کردوو پێیان هەلگرتو ویستیان بەپەلە تێ پەڕن، ئەویش پێی فەرموون: پەلەمەکەنو مەپەشۆکێن ئەمە صەفییەی کچی حویەییە کەژنی خۆمە، ئەوانیش گوتیان سوبحانەڵلا! ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە چۆن دڵ لەتۆ پیس دەکەین! وە قسەکەی پێغەمبەریان بەلاوە گران بوو، کە بۆنی ئەوەی لێ دەهات، خوانەخواستە گومانی خراپ بە پێغەمبەر بەرن.

فەرمووی (دروودی خوای لەسەر بێ): ئاخر شەیتان لەناو جەستەی مرۆڤدا وەکوو خوێن هاتوو چۆ دەکات، لەبەر ئەوە ترسام کە شەیتان شتێ یا گومانێکی بەد بخاتە ناو دڵتانەوە دڵتان لەمن کرمێ ببێو ئەوە ببێ بەهۆی سەرتیا چونتانو خودا بەهۆی ئەو گومانە بەدەوە بە پێغەمبەرەکەی ڕقتان لێ بگرێ. (تاج/٢/١٤٦ ز/٧٥ ف/٢ — ش/د/ن).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

صەفییەی کچی حویەی هاوسەری پێغەمبەر، دایکی موسوڵمانانە، بە ڕەگەز جوولەکەیە، لەنەوەی هاروون پێغەمبەری برای حەزرەتی مووسای کوڕی عیمرانە (دروودی خوایان لەسەر بێ) لەساڵی حەوتی کۆچی دا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) مارەی کردووە، صەفییە تا بڵێی ژنێکی سەلاری هێمنی ژیری ڕێزدار بوو، ئافرەتێکی خانەدانی بەگزادەی شۆخ بوو، لەپێش ئازادکردنی قەڵای خەیبەر دا لەخەون دا دەبینێ مانگ دەکەوێتە ناو کۆشییەوە ئەم خەونە بۆ دایکی دەگێڕێتەوە دایکی مشتە کۆڵەیەك

لەڕوومەتی دەدا، کاری لێ دەکا، دەڵێ: ئەوە چییە ملت قوت دەکەیتەوە تابی بەهی پادشای عەرەب.

کاتێ کەدەکەوێتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) جێگەی مشتەکۆڵەکەی بەڕومەتیەوە مابوو، لێی دەپرسێ: ئەمە چییە؟ دەڵێ: ئەمە هی ئەو مشتەکۆڵەیە.

جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەبینێ: صەفییە دەگری دەفەرموێ: ئەوە بۆچی دەگریت؟ دەڵێ: حەفصەی ژنت پێم دەڵێ من کچە جوولەکەمو تانەی بنەجوویم لێ دەدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێت: تۆ کچی پێغەمبەریت، چونکە لەنەوەی هاروون پێغەمبەریت، وەهەم مامەت پێغەمبەر بوو، چونکە برازای پێغەمبەر مووسایت، هەم ژنی پێغەمبەریت کەمنم، ئیتر حەفصە شانازی چی بەسەر تۆدا دەکا! لەپاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بەحەفصە دەفەرموێ: ئەی حەفصە! لەخودا بترسە! صەفییە موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو بوو، زۆر زۆر پێغەمبەری خۆش دەویست، لەنەخۆشینی سەرەمەرگا هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێو ڕەزای خودا لەهاوسەرە بەڕێزەکانی) لەلای کۆبوونەوە، صەفییە فەرمووی: سوێند بەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! ئاوات دەخوازم کەئەم ئێش‌و ئازارو دەردەی تۆ بەمنەوە بێت!.

ژنەکانی تری لەناوخۆیانا بەچاوێ ئاماژەیان لەیەکتری کرد، کەدەبێ ئەمە ڕاست بێ؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی فەرموون: دەمتان بشۆرن، گوتیان بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا!؟ فەرمووی: بەهۆی ئەو غەیبەتەوە کەبەچاو کردتان! سوێندم بەخوا، صەفییە ئەم قسەیەی لەدڵەوە بوو، بەڕاستی بوو.

صەفییە فەرموودەی لەصەحیحی بوخاری دا هەیە، خۆی فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، ئەم زاتانەش فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە،

کنانەی برازای و یەزیدی کوڕی موعتەبی ئازادکراوی خۆی و زەینولعابیدینی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین.

ڕای بەهێز ئەوەیە کەلەسەردەمی جێنشینی موعاویەدا لەپەنجاو دووی کۆچی دا، لەتەمەنی شەست ساڵی دا جیهانی بۆ دواجار بەجێهێشتووە!.

لەمەینەتەکەی ئیمام عوسمان دا بەسواری هێسترێ ویستی بچێ بۆ بەرگری لەخەلیفە عوسمان گەمارۆ دەرەکان نەیانهێشت بەڵام صەفییە تا دواترین کات نان و ئاوی برد بۆ عوسمان (ڕەزای خوای لێ بێ) بڕوانە: (تاج/١٦١/٥ ز/٤١).

٩٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَانَ عَشْرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا. (الحديث ٢٠٤٤، طرفه ٤٩٩٨)[٣٤٢].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودو سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەتی خودای گەورەی لەسەر بێ و سەرو ماڵ و هەست و نەست و دایك و باوك و منداڵ بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) وابوو لەهەموو ڕەمەزانێکا دە ڕۆژ لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، بەڵام لەو ساڵەدا کە تیایدا وەفاتی کرد، بیست ڕۆژ خەڵوەی کێشا، بڕوانە (ریاض/٩٣١/٣ ف/٣ ز/٢٣٢ + تاج/١٤٤/٢ ف/٢ ز/٧٤).

## پایانێ (خاتیمەیێ)

عەسقەلانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: باسەکانی تەراویح شەوی لەیلەتولقەدرو نامەی خەڵوەکێشان (٣٩)فەرمودەی بەرزەوەبوویان لەخۆیان گرتووە، دوو فەرموودەیان بێڕشتە (تعلیق)ن، دووبارەکانیان (٣٠)فەرمووودەن، پوختەکەیان (٩) فەرموودەیە، هەموویان پێشەوا

[٣٤٢] لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح ٢٨٦/٤ – خاتمة كتاب الإعتكاف) –المترجم.

موسليميش (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گێڕاونییەتیەوە، ئەم دوانەیان نەبێ:

١- (٩٢٤ ت = ٢٠٢١ ف).

٢- (٩٢٣ ت = ٢٠٤٤ ف).

وەچەند بیستراو (أثر)ێکیشی واتیادا.

شەوی لەیلەتولقەدر، (بیست و حەوتی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٢٣ کۆچی = شەوی ٢٠٠٢/١٢/٢ زایینی، سلێمانی/مامۆستایان ماڵی خۆمان، خوا بیپارێزێ، ئامین).

## ئەمە کۆتایی بەرگی دووەمە

**روبعی عیبادات تەواو، سەرەی روبعی موعامەلاتە بە (کتاب البیع) دەست پێ دەکات.**

**وەرگێڕ/ نووری فارس حەمە خان**

# فەهرەسی باسەکان

| باسەکان | لاپەڕە |
| --- | --- |
| **٣٥- باسەکانی فەزڵو گەورەیی مەدینە** | ٤ |
| **٣٦- نامەی ڕۆژوو** | ٣٧ |
| باسەکانی رۆژووی سوننەتو هەندێ بابەتی تری ڕۆژوو | ٧١ |
| **٣٧- نامەی نوێژی تەراویح** | ٨٦ |
| باسی گەورەیی‌و پیرۆزی شەوی لەیلەتولقەدر | ٨٧ |
| **٣٨- نامەی خەڵوەکێشان** | ٩١ |
| باسی خەڵوەکێشان لەدەی کۆتایی ڕەمەزان دا وە باسی دروستی خەڵوەکێشان لەهەموو مزگەوتێك دا | ٩١ |

تمّ بحمدِ الله